سەرگای ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان

## د. عەلی وەردی

# وانەکانی ژیانم

لە عەرەبییەوە: د. نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد



د.عەلی وەردی

# وانەکانی ژیانم

لە عەرەبییەوە :

د. نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد




ناوەندی توێژینەوەی مێژوویی جەمیل ڕۆژبەیانی ٢٠١٧

بەڕێوەبەری دەزگا: سیروان حەمەسەعید

ناوی کتێب: وانەکانی ژیانم

ناوی نووسەر: د.عەلی وەردی

لە عەرەبییەوە : د. نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

دیزاینی ناوەوە: ئومێد محەممەد

دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی

زنجیرە: ( ٣١ )

نۆرەی چاپ: ٢٠١٧

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

نرخ: ٤٠٠٠ دینار

چاپ: چاپخانەی ئاران

بەڕێوەبەرێتی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٢٨٢ )ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە



Tel: 0533202936 07502216705

email: jamalerfan99@gmail.com

facebook: Jamal Erfan's Library

www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی - کاسۆ مۆڵ - بەرامبەر مزگەوتی گەورە - نهۆمی چوارەم

# ناوەرۆك

## پێشەکیی وەرگێڕی کوردی

کۆمەڵناس و مێژوونوسی ناوداری عێراقی دکتۆر عەلی وەردی (١٩١٣-١٩٩٥) لەشاری بەغدا لە کازمیە لەدایک بووە، لەقۆناغی ئامادەییدا لەسەر ئاستی هەموو عێراق یەکەم بووە، بۆیە لەسەر حیسابی دەوڵەت نێردراوە بۆ زانکۆی ئەمریکی لە بەیروت، لەساڵی ١٩٤٣ بەکالۆریۆسی لە سۆسیۆلۆجیا لە زانکۆی ئەمریکی لە بەیروت تەواو کردووە، لەساڵی ١٩٤٨ ماستەری لە سۆسیۆلۆجی لەزانکۆی تکساسی ئەمریکی وەرگرتووەو ناونیشانی نامەی ماستەرەکەی بریتییە لە: (لێکۆڵینەوەیەک لە سۆسیۆلۆجیای ئیسلام)، لەساڵی ١٩٥٠دا دکتۆرای لە سۆسیۆلۆجی لە زانکۆی تکساس لە ئەمریکا بەدەست هێناوەو ناونیشانی تێزی دکتۆراکەی بەمجۆرەیە: (تیۆری مەعریفە لەلای ئیبن خەلدون).

پاشان گەڕاوەتەوە بۆ عێراق، لەسەرەتای پەنجاکانەوە تا ساتی خانەنشینی لەساڵی ١٩٧٠ دا، لەکۆلێجی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا وانەی سۆسیۆلۆجیای وتۆتەوە. بەڵام نەک تەنها خوێندکارانی بەشی کۆمەڵناسی، بەڵکو خوێندکارانی هەموو بەشەکانی تری کۆلێجی ئەدەبیات لە لێکستەکانیدا ئامادە دەبوون، بەچەشنێک هیچ

هـۆڵێکی زانکـۆ جـێگەی ئەو هەمـوو گـوێگرە لە خوێنـدکاران و مامۆسـتایان نەدەبـووەوە، بـۆیە زۆربەیـان لە دەرەوە دەوەسـتان و دەنگـی وەردی لەرێـگەی مـایکرۆفۆنەوە دەگەیەنـرایە دەرەوەی هۆڵەکەش.

لەماوەی پتر لە نیو سەدەی ژیانی زانستی و نووسیندا، کۆمەڵێ کتێبی زۆر گرنگی چاپکردووە، لەوانە: کەسـایەتیی تـاکی عێراقـی ١٩٥٠، خـوارق اللاشعور ١٩٥١، گاڵتەجاڕیی ئەقڵی بەشـەری ١٩٥٤، واعیزی سوڵتانەکان ١٩٥٥، ئەفسانەی ئەدەبی بڵند ١٩٥٧، خەون لەنێـوان زانسـت و بـاوەڕدا ١٩٥٩، لـۆجیکی ئیـبن خەلـدون ١٩٦٢، لێکـۆڵینەوە لە سروشتی کۆمەڵگەی عێراقی ١٩٦٥، چەند نیگایەکی سۆسـیۆلۆجی لەمێـژووی نـوێی عێـراق ١٩٦٩، و زۆری تریش کە زوربەیان وەرگێڕدراون بۆ زمانە ئەوروپی و خۆرهەڵاتییەکان و هەندێکیان بۆ زمانی کوردی وەرگێڕدراون.

تێـزی سـەرەکیی عەلـی وەردی بـریتییە لە شیکردنەوەی سۆسیۆلۆجیی کۆمەڵگەی عێراقی کە لەمیـانی ئەو شـیکردنەوەیەدا رەخـنە لە پەیوەنـدیی کۆمەڵایەتی و لە دیاردەو نەریتە کۆمەڵایەتییەکان و لە سـایکۆلۆجیای دووفـاقیی تـاکی عێراقی دەگرێت، عەلـی وەردی تێـزەکەی لەسـەر سـێ فـاکتەری سەرەکی بنیات دەنێت:

یەکەم: ململانێی نەریتی دەوارنشینی و کولتوری شارنشینی (صراع البداوة والحضارة)
دووەم: دووفاقیی کەسایەتی (إزدواج الشخصية)
سێیەم: دژیەکیی کۆمەڵایەتی (النشاز الاجتماعي)
پاشان لێکۆڵینەوەکانی دەربارەی سروشتی کۆمەڵگەی عێراقی و لایەنی دەروونیی تاکی عێراقی بەرەو ئاقارێکی زانستیی وای دەبەن کە دواتر بایەخی سەرەکیی دەداتە "میتۆدی سایکۆسۆسیۆلۆجی"، بەو پێیەی (دەروونناسی) و (کۆمەڵناسی) پێکەوە، باشتر دەتوانن کەسایەتییە ئاڵۆزەکانی تاکی عێراقی و نەریتە کۆنەکانی کۆمەڵگەی عێراقی بخوێننەوە.
عەلی وەردی بیرەوەرییەکانی خۆی لەکتێبێکدا بەشێوەی بیرەوەریی تەقلیدی نەنوسیوەتەوە، بەڵکو لەمیانی چەندین چاوپێکەوتن و نووسینی رۆژنامەوانیدا باسی منداڵی و قۆناغەکانی خوێندن و سەرەتاکانی نووسینی خۆی کردووە، ئەم بابەتەش کە لەساڵانی هەشتاکانی سەدەی بیستدا بە زنجیرەو بە دوانزە بەش بڵاوی کردوونەتەوە، بەمانای زانراوی ئۆتۆبایۆگرافی، بیرەوەری نین (وەک خۆی دەڵێ)، بەڵکو هەوڵی داوە جارێکی تر لەمیانی باسکردنی بیرەوەرییەکانی منداڵی و گەنجی، نەریت و دیاردە کۆمەڵایەتییەکان کەشف

بکات و شیکردنەوەیان بۆ بکات و هۆکارەکانیان بخاتەڕوو و ڕەخنەیان لێبگرێت. عەلی وەردی لەم بیرەوەرییانەدا، لەقۆناغی منداڵی و مێرمنداڵی و تا ساڵانی ١٩٣٥ بیرەوەرییەکانی خۆی دەگێڕێتەوە، ئەو ساڵانەی کە قۆناغی ئامادەیی بەپلەی یەکەم لەسەر ئاستی هەموو عێراقدا تەواو دەکات و دەنێردرێت بۆ زانکۆی ئەمریکی لە بەیروت. ئەم بابەتە، کە لەراستیدا جۆرێکی ترە لە ئۆتۆبایۆگرافیی عەلی وەردی، لە دوانزە بەش پێکهاتووە.

خوێنەری کورد دەتوانێت تێبینیی ئەوە بکات ئەو دیاردە کۆمەلایەتییانەی لە کۆمەڵگەی عێراقیدا هەبوون و هەندێکیان تا ئەمڕۆش پرۆسە دەکرێن و عەلی وەردی شیکردنەوەیان بۆ دەکات و ڕەخنەیان لێدەگرێت، تا ئەندازەیەکی زۆر لە کۆمەڵگەی کوردیشدا بوونیان هەیە، بەو پێیەی پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان و دیاردە کۆمەلایەتییەکانی کۆمەڵگەی عێراقی و کۆمەڵگەی کوردی تاڕادەیەکی زۆر لەیەک دەچن، بۆیە ئەو ڕەخنانەی عەلی وەردی ئاراستەی کۆمەڵگەی عێراقیی دەکات، لە زۆر لایەنەوە کۆمەڵگەی کوردیش دەگرێتەوە.

سلێمانی
18/1/2017

## بەشی یەکەم:
## نهێنیی پەیوەندیی نێوان
## ئیستانبوڵ و کازمیە

ئەم بیرەوەرییـــانە، کە خـــوێنەری ئـــازیز دەیـــانخوێنێتەوە، بیـــرەوەری نـــین بەو شـــێوەیەی لەبیرەوەریی کەسانی دیکەدا هەیە، من بەوەندە واز نـاهێنم ئەو روداوانە تۆمـــار بـکەم کە بەســـەرمدا هـــاتوون، بەڵکـو هەوڵ دەدەم لەژێـر تیشـکی ئەو تیۆرە زانستییانەی لەبواری پسپۆرییەکەی خۆمـدا خوێنـدوومن، شـیکردنەوەیان بـۆ بـکەم و بەدوای هۆکارەکانیاندا بگەڕێم، جا لە بەدبەختیم بێت یان خۆشـبەختیم، پسـپۆڕیم لە بـواری کۆمەڵناسـی و دەروونناسـیی کۆمەڵایەتی(سۆسـیۆلۆجیاو سـایکۆ-سۆسـیۆلۆجیا) بەدەسـتهێنا، بـۆیە بەردەوام بەو رووداوانەدا دەچـمەوە کە بەسـەرمدا هـاتوون و هەوڵ دەدەم، بەپێـی توانـا، لەرووی زانسـتییەوە راڤەیـان بـکەم، هەر ئەمەش بـوو وای لێکـردم ناونیشانی (وانەکانی ژیانم) یان (چەند وانەیەک لە ژیـانم) بـۆ ئەم بیرەوەرییـانە دابنـێم، کە لێـرەدا مەبەسـتم ئەوەیە ئەمـانە پتـر 'وانە'ن وەک لەوەی 'بیرەوەری' بن.

ئەوەی لە بیرەوەریی کەسانی دیکەدا تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە بەجۆرێک نوسیویانە پتر ستایشی خۆیان دەکەن، یان بەشێوەیەک وێنەی خۆیان دەردەخەن وەک بڵێی جەنگی ژیانیان بە ئیرادەی خۆیان و بەبریاری خۆیان کردبێت. ئەمە مەسەلەیەکە خوێنەر لەم بیرەوەرییانەی منیشدا دەیانبینێت.

من هەروەک کەسانی دی حەز دەکەم ستایشی خۆم بکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەست بەوە دەکەم کە ئیرادەی ئەوەم نەبوو خۆم خۆم دروست بکەم تەنها لە چوارچێوەیەکی زۆر دیاریکراودا نەبێت. ئێستاش کاتێک لە رووداوەکانی ژیانم ورد دەبمەوە هەر لە منداڵیمەوە تا پیریم، واهەست دەکەم زۆر جار من وەک ئەو (پەڕە) وام کە با دەیبات و خۆم هیچم نییە.

دەشێت رووداوێکی سادە یان رێکەوتێکی ناچیزە یان قسەیەکی سەرپێیی بەرزم بکاتەوە یان دامبگرێ بەجۆرێک نازانم چۆن. ئەمە ئەو شتەیە کە خوێنەر بە روونی لەم بیرەوەرییانەدا دەیبینێت.

بەر لە چەند ساڵێک یەکێک لە رۆژنامە عێراقییەکان وتارێکی بۆ بڵاوکردمەوە، ئەو وتارە دەستەواژەیەکی تیایە پێم باشە لێرەدا جارێکی دیکە بینووسمەوە، دەستەواژەکە بەم جۆرەیە: "ئەگەر لە

جەنگی یەکەمی جیهانیدا ئەنوەر پاشا لە تورکیا نەبوایە، ئەوا ئێستا من لە یەکێک لە کۆڵانەکانی کازمیەدا عەتارێک دەبووم یان لەباشترین حاڵەتدا عەریزەنوسێک دەبووم.'

لەوانەیە خوێنەر بپرسێت پەیوەندیی نێوان ئەنوەر پاشا لە ئیستانبوڵ و عەلی وەردی لە کازمیە، چییە؟ ئەنوەر پاشا لەکاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا بەهێزترین کەسایەتیی دەوڵەتی عوسمانی بوو، کەچی عەلی وەردی منداڵێکی بچکۆلە بوو و لەکۆڵاندا لەگەڵ منداڵەکانی تردا یاریی دەکردو زۆر هەژارو داماو بوو، باشە چۆن دەشێت هەرجۆرە پەیوەندییەک لەنێوان ئەم دوو کەسەدا دروست ببێت؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەڵێم ئەنوەر پاشا دەستێکی باڵای هەبوو لە راکێشانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ ناو جەنگەکە، هەروەک ئەمەم لە بەشی چوارەمی کتێبی (چەند نیگایەکی کۆمەڵایەتی لە مێژووی نوێی عێراق)دا شی کردۆتەوە، ئەمە مانای وایە ئەگەر ئەم پیاوە لە دەوڵەتی عوسمانیدا بوونی نەبوایە، ئەوا هەرگیز ئەم دەوڵەتە نەدەچووە نێو جەنگەکەوە، ئەوسا عێراقیش لەپاش کۆتاییهاتنی جەنگ هەر بە بەشێک لە دەوڵەتی عوسمانی دەمایەوە، ئیتر بۆ ماوەیەکی زەمەنی

کورت بوایە یان درێژ. لێرەدا نابێ ئەوەمان لەیاد بچێ کە کوڕی هەژاری وەک من بۆیان نەبوو یان نەیاندەتوانی بچنە قوتابخانە نوێیەکانی سەردەمی عوسمانییەوە، بەڵکو لەپاش بنیاتنانی دەوڵەتی عێراقی و هەڵبژاردنی فەیسەڵی یەکەم وەک مەلیکی عێراق، ئەوسا بۆیان رەخسا بچنە قوتابخانە، وەک دواتر باسی دەکەم.

شتێکی سەیر کە پێویستە بەم بۆنەیەوە لێرەدا باسی بکەم ئەوەیە، ئەنوەر پاشا لەساڵی ١٩١٦ و لەدوای سەرکەوتنی سوپای عوسمانی لە شاری(کوت)دا، سەردانیی عێراقی کرد، هاتە مەزارگەی پیرۆز لە کازمیە، وەک چۆن پێشتر بەهەمان شێوە سەردانیی مەزارگەی ئیمام ئەبوحەنیفە و شێخ عەبدولقادر گەیلانیی کردبوو، خەڵکی وەک عادەتی خۆیان بە هوتاف کێشانەوە هاتنە دەرەوە بۆ پێشوازیی ئەنوەر پاشا. ئەو کاتە من تەمەنم سێساڵان بوو، نەمدەزانی ئەم پیاوە، کە خەڵکی پێشوازیی لێدەکەن، رۆڵێکی گەورەی دەبێت لە دیاریکردنی چارەنووسی من و چارەنووسی هەزاران کەسی دیکەی وەک من، ئەمە سوننەتی خودایە لەهەموو زەمان و زەمینێکدا، مرۆڤ دەستی لە دروستکردنی خۆیدا نییە لەچوارچێوەیەکی زۆر تەسکدا نەبێت. ئێستا

لەرووی کـــردارەوە دەرکەوتـــووە کە پێکهـــاتەی کەسایەتیی مرۆڤ دەرەنجامی کارلێکی نێوان دوو جۆر فاکتەرە، فاکتەری بۆماوەو فاکتەری ژینگە یان دەوروبەر. مـرۆڤ بە چەنـد سیفەتێکی دیـاریکراو لەدایـــک دەبێـــت لە روخســـارو لە بەژن و بـــاڵاو شێوەی دەموچاوی، هەروەها لە توانای دەروونی و پێکهاتەی کۆئەندامی دەمارو هۆرمۆن و شتی تر، ئەم ســیفەتانە لەدواییـدا دەچـنە نێـو ئەو ژیـنگە کۆمەڵایەتییەی کە مـرۆڤ هەر لە منداڵییەوە تیایـدا گەورە بـووە، ئـاوێزانی ئەو رووداو و رێکەوتـانە دەبێت کە بەسەریدا دێن، بەمجۆرە کەسایەتیی ئەو شەخسە دروست دەبێت سا بیەوێت یان نەیەوێت.

گرفتـــی هەنـــدێ لەو کەســـانەی لە ژیانـــدا ســـەرکەوتوون ئەوەیە دوچـــاری لەخۆبـــاییبون و لەخۆرازیبـون دەبـن و پێیـان وایە خۆیـان خۆیانیان دروست کردووە، ئەو بارودۆخ و رێکەوتانەیان بیر دەچێـــت کە لەژیانیانـــدا ڕوبەڕوویـــان دەبێـــتەوە، هەروەک ئەو خەســـڵەتە بۆماوەیەشـــیان بیـــر دەچێـتەوە کە لە بـاوانەوە بۆیـان مـاوەتەوەو وای لێکردوون سوود لەو دۆخ و رێکەوتانە ببینن.

کەسـێکی لەم چەشـنە دەناسـم کە مـاوەیەک لەمەوپـێش مـرد، ئەو کەســە بەئەنـدازەیەکی زۆر شانازیی بەخۆیەوە دەکردو پێی وابوو خۆی خۆی

دروست کردووە، کەسێکی ژیرو ڕێکئەندام و قۆزو ئەنیق بوو و سەر بە خێزانێکی خۆشگوزەران بوو، لە فەرمانگەکانی حکومەتدا گەیشتە پلەیەکی باشی وەزیفی، ئیدی لەخۆبایی بوو و بەفیزەوە ڕێی دەکرد.

ئەو کەسە ئەو نیعمەتانەی بیر دەچێت کە سیفەتە جوانەکانی لەدایک و باوکیەوە بۆ ماوەتەوەو هەروەها ئەو هەلومەرج و ژیانەی بۆیان دابین کردووە، دەشێت چەند کەسێکی نزیکی خۆی هەبێت کە لەخێزانێکی هەژاردا گەورە بووبن و ناچار بووبن لە منداڵییەوە کار بکەن بۆ قوتی ژیانیان، کەسانی دیش هەبوون دوچاری نەخۆشی و دوومەڵ بوون لە ڕوخسارياندا، یان کەمئەندام بووبن، یان ژیرییەکی کەمیان هەبێت، بەدرێژایی ژیانیان بێهودە هەوڵ و کۆششی بەردەوام دەکەن.

خەڵکی واڕاهاتوون ڕێز لە کەسی سەرکەوتوو بگرن و رقیان لە کەسی ژێرکەوتوو بێتەوە، لەو باوەڕەی گوایە هەریەک لەوانە خۆیان خۆیانیان دروست کردووە، ئەمەش بۆتە مایەی سەرهەڵدانی ستەمێکی زۆری کۆمەڵایەتی لەنێو خەڵکیدا. ئەوان کاتێک ڕێز لە کەسی سەرکەوتوو دەگرن لەڕاستیدا زیاد لە شایستەی خۆی دەدەنێ، کاتێکیش رقیان لە کەسی ژێرکەوتوو دەبێتەوە ئەوا زوڵمی لێدەکەن و

پێیان وایە تەنها خۆی بەرپرسیارە لە فەشەلی خۆی.

ئەمڕۆ ژمارەی دانیشتوانی سەر گۆی زەوی گەیشتۆتە پتر لە پێنج ملیار کەس، هەر یەکێک لەوانە چیرۆکی ناوازەی خۆی هەیەو لەچیرۆکێکی تر ناچێت، هەر یەکێکیش لەوانە خاوەنی کەسایەتییەکی تایبەتییەو لەکەسایەتییەکی دیکە ناچێت.

**سەرەتاکانی بیرەوەریم**

جەنگی یەکەمی جیهانی گەورەترین کارەسات بوو کە لەمێژووی نوێیدا بەسەر عێراقدا هات، قەدەر وای هێنا لەساتەوەختی راگەیاندنی ئەو جەنگەدا من تەمەنم یەک ساڵ بوو، بۆیە یەکەمین بیرەوەرییەکانم دەربارەی ئەو ژیانەی تیایدا گەورە بووم، پڕیەتی لە تاڵی و ئازار، بەچەشنێک ئەستەمە لەبیر بکرێت.

عێراق لەکاتی راگەیاندنی جەنگی یەکەمدا، وەک پێشتر ئاماژەم بۆکرد، بەشێک بوو لە دەوڵەتی عوسمانی. سەرلەبەیانیی رۆژی ٣ی ئابی ساڵی ١٩١٤ لەناکاو خەڵکی عێراق و هەموو ناوچەکانی تری ژێر دەسەڵاتی عوسمانی، گوێیان لە دەنگی لێدانی تەپڵ بوو کە بەشێوەیەکی نائاسایی و

بەردەوام لێی دەدا، هەروەک لەسەر دیوارەکاندا ڕاگەیاندنی "نەفیر عام" بڵاوکرابووەوەو داوای لەو سەربازانە دەکرد کە خزمەتیان تەواو کردووە، دەمودەست پەیوەندی بە یەکەکانیانەوە بکەن.

باوکم زێڕنگەر بوو لەدوکانێکی نزیکی ماڵی خۆمان کاری دەکرد، هەروەها خزمەتی سەربازیی تەواو کردبوو و ئەم بانگەوازە ئەویشی دەگرتەوە، هەر کە ئەو هەواڵەی بیست یەکسەر دوکانەکەی داخست و گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو خۆی حەشاردا، هەموو ئەو کەسانەی ئەو بڕیارە دەیگرتنەوە هەمان شتیان کرد.

دایرەی تەجنید (یان: فەرمانگەی بەسەربازیکردن) بەدوای باوکمدا دەگەڕان، ئەویان دەست نەکەوت باپیرمیان دەستگیر کرد کە تەمەنی هەشتا ساڵ بوو، بڕیاریان دا ئازادی نەکەن تا ئەو کاتەی باوکم خۆی بەدەستەوە دەدات، ئیدی باوکیشم ناچار بوو خۆی بەدەستەوە بدات. لەتەک چەندین سەربازی دیکەدا بۆ بەغدایان ناردن، لەوێشەوە بە پاپۆڕ بەرەو گوندی (موزەیرەعە)یان بردن کە دەکەوێتە سەر کەناری دەریای عەرەب لەنزیک (گوڕنە). لەو شوێنەدا جەنگێکی سەخت ڕوویدا لەنێوان سوپای عوسمانی و سوپای ئینگلیزدا، سوپای ئینگلیز شەڕەکەی بردەوە،

سەربازەکانی سوپای عوسمانی بەهەموو لایەکدا هەلاتن، هەندێکیان بە مەلە لە دەریای عەرەب پەڕینەوەو زۆربەشیان لە دەریاکەدا خنکان، باوکم یەکێک بوو لەو ژمارە کەمەی رزگاریان بوو.

باوکم و ئەوانەی دەربازیان ببوو پەنایان بردە بەر عەشیرەتی بەنی ئەسەد لە ئەهوارەکانی (جبایش)، لەوێ لەلایەن سەرۆکی عەشیرەتەکە (شێخ سالم خەیون) پێشوازییەکی باشیان لێکراو خزمەتێکی باشیان کردن، پاشان لە عەشیرەتێکەوە بەرەو عەشیرەتێکی تر دەڕۆیشتن.

دواجار باوکم گەیشتەوە ماڵەکەی خۆی لە کازمیە، بەلام لە حاڵێکی زۆر نالەباردا بوو، دیسان خۆی شاردەوە، لەشانسی باوکمدا لە شەڕی موزەیرەعەدا ناوی لە لیستی کوژراوەکاندا هاتبوو، بۆیە بەدڵنیاییەوە لەماڵەوە دەنوست و دایرەی تەجنید بەدوایدا نەدەگەڕان، بەلام سڵیشی لەوە دەکردەوە کە هەواڵی ئەم خۆشاردنەوەیەی بەجۆرێک لە جۆرەکان بگاتە دایرەی تەجنید، بۆیە بریاری دا بەنهێنی بچێت بۆ نەجەف.

نەجەف لە ٢٢ی ئایاری ساڵی ١٩١٥دا یاخیبوونی لەدژی دەوڵەتی عوسمانی راگەیاندبوو، بەلام دەوڵەتی عوسمانی نەیدەویست سزای ئەو یاخیبوونەی بدات چونکە شارێکی پیرۆز بوو،

سزادانیشی دەبووە هۆی ئەوەی نەیارەکانی پروپاگەندەی خراپ لەدژی دەوڵەتی عوسمانی بکەن. نەجەف لەپاش راگەیاندنی یاخیبوون، لەرێگەی سەرکردە لۆکاڵییەکانی، خۆی حوکمی خۆی دەکرد، هەروەک ببوو بە پەناگەیەک بۆ هەڵاتووانی سەربازی. ئیدی نەجەف پڕ بوو لە سەربازی هەڵاتوو (فیرار)، باوکیشم یەکێک بوو لەو هەڵاتووانە. بەڵام لەگەڵ یەکێک لە دوکاندارە زێڕینگەرییە نەجەفییەکاندا کاری دەکرد، لە یەکێک لە (خان)ەکانی گەڕەکی (میشراق)دا ژوورێکی بەکرێ گرت، پاشان هەواڵی نارد بۆ دایکم کە منیش هەڵبگرێت و بێت بۆ نەجەف.

لەگەڵ دایکمدا بەو گالیسکەیەی ولاخ رایدەکێشا سەفەرمان بۆ کەربەلا کرد، لە کەربەلاشەوە بەسواری ولاخ و لەسەر پشتی گوێدرێژ سەفەرمان بۆ نەجەف کرد. من ئەوسا تەمەنم چوار ساڵ بوو. ئەم سەفەرە یەکەمین رووداوە کە لە یادەوەریی منداڵیمدا مابێتەوە، تا ئێستاش لەیادوەریمدا جێگیرە.

لەو ژوورەدا ماینەوە کە باوکم لەیەکێک لە خانەکاندا بەکرێی گرتبووی، ژوورەکە کەوتبووە سەر دەرگای خانەکە. یەکێک لەو بیرەوەرییانەی ئەو کاتەم کە هەرگیز لەیادم ناچێت: رۆژێکیان لەنزیکی دەرگای خانەکە وەستابووم و تفەنگێکی

دارینم بەدەستەوەبوو باوکم بۆی کڕیبووم تا گەمەی پێبکەم، لەناکاو منداڵێکی لەخۆم گەورەتر پەلاماری دام و تفەنگە دارینەکەی لەدەست فراندم و هەڵات، بینیم لە کۆڵانەکەدا ڕایدەکردو تفەنگەکەی دەستی بەرز دەکردەوەو رایدەوەشاندو شانازیی پێوە دەکرد. منیش چوومەوە بۆ خانەکەو دەستم کرد بە گریان، لای دایکم شکاتم کردو باسی ئەو زوڵمەم بۆ کرد کە بەسەرمدا هاتووە. ئەمە یەکەمین زوڵم بوو کە لەژیانمدا ڕووبەڕووی بوومەتەوە، نەمدەزانی ئەم ڕووداوە، لەم دونیایەی ئێمەی تیادا دەژین، مەسەلەیەکی ئاساییە.

ماوەیەکی زەمەنی لە نەجەف ماینەوە نازانم چەند بوو، بەڵام ڕۆژێکیان لەنێو خەڵکیدا هەراوزەنایەکی زۆرم بینی و بەروخساری خەڵکەکەدا گەشانەوەیەکی زۆر دەبینرا، دواتر بۆم دەرکەوت کە بەغدا کەوتۆتە بەر دەستی ئینگلیزەکان ، ئەمەش هۆکاری خۆشحاڵیی خەڵکەکە بوو، کەوتنی بەغدا واتە کۆتایی بەڵاو نەهامەتییەکانی ژیانی سەردەمی عوسمانی. ئینگلیزەکان دوو ئەفسەریان نارد بۆ نەجەف تا لەئەحواڵ و کاروباریان بپرسنەوە، خەڵکێکی بێشومار بە ژن و پیاوەوە هاتنە دەرەوە بۆ پێشوازی، منیش لەتەک دایکمدا هاتمە دەری بۆ

پێشوازی، ئیدی بەنێو ئەو هەموو گۆڕە زۆرانەدا دەڕۆیشتین کە لەدەرەوەی نەجەفدا هەن. خۆشی و بەختەوەری هەموو خەڵکەکەی داگرتبوو و خەیاڵی ئەوەیان دەکرد کە قۆناغێکی دیکەی ژیانیان دەست پێدەکات و ڕۆژانی داهاتوو جیاواز دەبێت لە ڕۆژانی ڕەشی ڕابردوو.

ئەو سەبازە هەڵاتووانەی پەنایان بۆ نەجەف بردبوو، پەیتا پەیتا بەشێوەی جیاجیا دەگەڕانەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان، بەڵام ئێمە بە ترامواى (ئەو گالیسکەیەی چەند ئەسپێک ڕایدەکێشن) چووین بۆ کوفە، لەوێشەوە سواری کەشتی بووین بەرەو شارۆچکەی توەیریج کە ئێستا پێی دەڵێن (هیندییە).

ئەو کەشتییەی هەڵیگرتبووین کرابوو بە دوو بەشەوە، لەناوەڕاستدا پەردەیەکیان دانابوو، بەشێکی بۆ پیاوان و بەشێکی بۆ ژنان، جا لەبەر ئەوەی من منداڵ بووم بۆم هەبوو لەم بەشەوە بچم بۆ ئەو بەشەی دی و لەنێوان بەشی پیاوان و بەشی ژناندا هاتوچۆ بکەم. کاتێک گەیشتینە توەیریج، بەسواری گوێدرێژ چووینە حیللە، لەوێشەوە بەو گالیسکانەی ولاخ ڕایدەکێشان (یایلی) یان (پەیتون) یان (تریشقە)، گەیشتینە کازمیە.

## بەشی دووەم:
## سەردەمی رووخان ۱۹۱۷

لە ۱۱ی مارسی ۱۹۱۷دا ئینگلیز بەغدای داگیر کرد، بەمە سەردەمێکی دی لەلای خەلکی دەستی پێکرد کە ناویان نا (سەردەمی رووخان)، ئەو مندالانەیشی لەو کاتەدا لەدایک بوون پێیان دەووتن (منالانی سەردەمی رووخان)، خەلک لەو سەردەمەدا شتی سەرسوڕهێنەریان دەبینی و نەیاندەتوانی راڤەی بکەن، بۆیە دەربارەی ئەو شتانە مشتومڕیان دەکرد، ئەو کاتە من گوێم بۆ هەندێ لەو مشتومڕانە هەلدەخست، بەتایبەتی ئەوکاتەی باوکم لە ئێوارانی هەندێ رۆژدا لەگەل خۆیدا دەیبردم بۆ چایخانە. زۆربەی گفتوگۆ و مشتومڕەکانیان دەربارەی ئەم بابەتانەی خوارەوە بوون:

١- هەندێ داهێنانی سەیرو سەرسوڕهێنەریان بینی کە لەسەردەمی عوسمانیدا هیچ شتێکیان دەربارەی نەدەزانی، وەک فڕۆکەو رووناکیی کارەبا. ئیدی لەخۆیانەوە قسەیان لەسەر دەکردو هەندێ جار دەیانپرسی چۆن بۆ کافران رەخساوە ئەم شتانە دابهێنن کەچی موسلمانان نەیانتوانیوە هاوشێوەی ئەمانە شتێک دابهێنن.

٢- بینییان حوکمی ئینگلیز دادپەروەرانەترو نەزیهتترە وەک لە حوکمی عوسمانی، ئیدی ئەیانپرسی بۆچی کافر دادپەروەرەو موسڵمان ستەمکارە، کامیان بۆ فەرمانڕەوایی خەڵک باشترە، کافرێکی دادپەروەر یان موسڵمانێکی زاڵم؟

٣- بە چاوی خۆیان بینییان ژنی ئینگلیز بە سفور (واتە بەبێ عەباو پەچە) بەناو بازاڕدا دەڕوات و لەگەڵ خەڵکیدا قسە دەکات و بۆیان پێدەکەنێت، پێیان وابوو ئەمە رەفتارێکی ناشیرینەو پێچەوانەی شەرەف و پاکژیی ئافرەتە، باشە چۆن پیاوانی ئینگلیز بەم رەفتارەی ژنەکانیان رازی دەبن؟ بەمسۆگەری ئەوانە غیرەت و ناموسیان نییە.

**قسەوباسی فڕۆکە**

بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی، خەڵک فڕۆکەیان نەدیبوو، بەڵام لەساڵی ١٩١٠دا شتێکیان دەربارەی بیستبوو، بەتایبەتی ئەو کاتەی یەکێک لە رۆژنامەکانی بەغدا هەواڵێکی دەربارەی بوونی فڕۆکە بڵاو کردەوە. گوێم لێبوو باوکم لە چایخانەکەدا باسی ئەو سەرسوڕمانەی بۆ هاوڕێکانی دەکرد کە لەدوای بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە دوچاری خەڵکی ببوو، لەو دەمەدا باوکم چیرۆکێکی گێڕایەوە شایستەی ئەوەیە منیش لێرەدا بیگێڕمەوە.

باوکم لەزمانی باوکیەوە سەید موحسین دەیگێڕایەوە کە چەند کەسێک لە هاوەڵانی بە حەپەسانەوە هاتوون بۆ لای و پێیان وتووە کە ئەفرەنجەکان (واتە بیانییەکان، یان ئینگلیزو فەرەنسییەکان) عارەبانەیەکیان دروست کردووە بە ئاسماندا دەفڕێت کە مەبەستیان فڕۆکە بوو، ئیدی باپیریشم سەرزەنشتی کردوون چۆن باوەڕ بە هەواڵێکی وا دەکەن کە ئەقڵ قبوڵی ناکات. پێی وتوون: چۆن ئەقڵی ئێوە تەسەوری ئەوە دەکات عارەبانەیەک بە هەوادا بفڕێت؟ عارەبانە وەک دەزانن لە تەختەو ئاسن دروست کراوە، ئاخر مەعقولە تەختەو ئاسن بە هەوادا بفڕێت؟ خودا ئەقڵی پێداوین تا بیر بکەینەوە! جا بۆ ئەوەی باپیرم راستیی قسەکانی بسەلمێنێت، دەستی بۆ چەکوشێک درێژ کرد کە لە تەنیشتیدا دانرابوو، بە چەکوشەکەی وت: "ئەی چەکوش بفڕە!!" ئیدی ئاوڕی لە جەماعەت دایەوەو دیسان گلەیی لێکردن کە باوەڕ بە هەواڵێکی وا مەحاڵ دەکەن کە ئەقڵ قبوڵی ناکات.

شەش ساڵ بەسەر ئەم چیرۆکەدا تێنەپەڕیبوو، لەناکاو خەڵکی بینییان فڕۆکەیەکی ئینگلیزی بەسەر سەریانەوە دەفڕێت و بۆمب بارانیان دەکات. باپیرم

و خەڵــکەکەی دی تەماشــای ئاســمانیان دەکــردو دەمیان داچەقاندبوو و نەیاندەزانی چی بڵێن.

هەر لەم بـــوارەدا دەگێـــڕنەوە، یەکێـــک لە عەشیرەتە لادێییەکانی نزیک شاری بەسرە، کاتێک بینییان فڕۆکەیەکی ئینگلیزی لەبەرزایی ئاسمانەوە دەفڕێت، ئیدی خۆیـان نەگرت و دەستیان کرد بە (هۆســە) کە ئەمە لە خــوارووی عێراقـدا بـاوە، لەو هۆســەیەدا دەیــانوت: (ســەیرە خــودای خــالق حوشــتری خـۆی هەیە!!). ئەنـدامانی ئەو عەشیرەتە لەو هۆسـەیەدا ئاماژەیـان بـۆ ئەو ئـایەتە قورئـانییە دەکرد کە دەفەرموێ: (أفلا تنظرون الى الإبل كيف خلقــت). ئەمە مانــای وایە ئەوان پێیـــان وابـــوو دروســـتکردنی فـــڕۆکە ســـەیرترە لە خەڵقکردنـــی حوشتر، بیریـان چـوو وەک چـۆن خـودا حوشـتری دروست کردووە ئاوا باڵندەشی دروسـت کـردووە، بەڵام ئەوان لە حـــاڵەتی حەپەســـاندا بـــوون و نەیاندەزانی دەڵێن چی.

لە ســـەردەمی رووخانــدا، دیمەنـــی فـــڕۆکە، کە بەئاســـماندا دەفڕێـــت، لەلای خەڵـــک مەســـەلەیەکی ئاســـایی بـــوو و هـــیچ پرســـیارو حەپەســـانێکی لەلا نەدەوروژانـــدن. ئەمە هەمیشـــە عـــادەتی بەشـــەرە بەرامبەر بەو شتە سەیروسەمەرانەی پێشتر هیچی لێنـــازانن و دواتـــر ئاشـــنای دەبـــن. لەســـەردەمی

عوسمانیدا هەمان شت سەبارەت بە پاپۆڕو ئامێری کارەباو ئامێری بەرگدوورین و ئۆتۆمۆبێل روویدا، بەم دواییەش بەرامبەر رادیۆ و تەلەڤیزیۆن روویدا. جیاوازیی نێوان مەحاڵ و مومکین لەتێڕوانینی بەشەردا، بریتییە لە جیاوازیی نێوان شتی زانراو و نەزانراو.

یەکێک لەو ئەهزوجەو هۆسانەی ئێمەی منداڵ لە سەردەمی رووخاندا دەمانوتەوە، ئەمە بوو: (تەیارە تەیارە لە سەرەوەیەو مەدامی تێدایە) بە عەرەبی (طیارە طیارە فوق فیها مدامة)، مەبەستمان لە مەدام ئەو ژنە ئینگلیزە بوو کە لەو رۆژگارەدا دەمانبینی بە سفوری (واتە بەبێ عەباو پەچە) لە بازاڕدا پیاسەی دەکرد. ئیدی وای لێهات فڕۆکەو مەدام لەتێڕوانینی ئێمەدا دوو دیاردەی ئاسایی بن.

لە پەیوەست بەم بابەتەوە، نەقیبی ئەشرافەکانی بەغدا بەڕێز عەبدولڕەحمانی گەیلانی فەرمانی بە ژنەکانی کردبوو: کاتێک کە لە حەوشەدا دەبن و فڕۆکە بەسەر سەرتانەوە دەفڕێت، دەبێ حیجاب بپۆشن و لەچک لەسەر بکەن. لەوە دەترسا فڕۆکەوانەکە لەسەرەوە بەدووربینەکەی تەماشایان بکات. نەیدەزانی لەدواییدا کچانی نەوەکەی خۆی بەبێ عەباو پەچەو بە سفوری بەناو بازاڕدا دەڕۆن، رێک وەک ئەوەی مەدام دەیکات.

## سەیروسەمەرەیی کارەبا

لەسـەردەمی رووخانـدا، گلـۆپی کارەبـایی سەیروسەمەرەترین شتێک بوو کە خەڵکی دوچاری سەرسوڕمان وحەپەسان و تاسان کردبوو، بگرە لە بینیـی فرۆکەش سەیروسـەمەرەتر بـوو، چـونکە خەڵکی پێشتر لەگەڵ چرای نەوتیدا راهـاتبوون کە پێیـان دەووت (فـانۆس)، ژمـارەیەکی زۆری ئەو فانوسانە لەسەر رێگاو کۆڵانەکاندا هەڵدەواسران تـا شـەوان رێگـای رێبـواران رووناک بـکەنەوە، پیاوێکیش تایبەت بۆ ئەو کارە تەرخان کرابوو و پێیان دەووت (نەفتچی) کە ئێواران نەوتی تێدەکردن و فتیلەکـانی دادەگیرسـاند، بەیانیـان زووش دەیکوژاندنەوە، بەڵام لەناکاو لەسەردەمی رووخـاندا چاویـان بەو گلـۆپە کارەباییـانە کەوت کە بەسـەر عامودەکانـدا هەڵواسـرابوون، ئەو گلۆپـانە بەبـێ نەوت و نەفتچییـەکە خۆبەخـۆ دادەگیرسـان و دەکوژانەوە، هێزی رووناکییەکەیشی دوو ئەوەندەی هێـزی روونـاککەرەوەی فانۆسـەکان بـوو. ئەمە لەتێڕوانینی خەڵکی ئەوسادا شتێکی لە دژەبـاو و سـەمەرە بـوو، ئیـدی هەرکەسـەو بەجۆرێـک دەربـارەی هۆیەکـانی ئەو گلۆپـانە قسـەی دەکـردو بەپێـی زانیـاری و تێگەیشـتنی خۆیـان لێکیـان دەدایەوە.

رۆژنامەی (العرب) کە لەو سەردەمەدا لە بەغدا دەردەچوو، لە ژمارەی رۆژی ٣ی نۆڤێمبەری ساڵی ١٩١٧دا بابەتێکی دەربارەی ناوەرۆکی ئەو گفتوگۆیانە بڵاوکردۆتەوە کە لەنێو خەڵکیدا سەبارەت بە گڵۆپی کارەبایی باو بوو، لەو دەمەدا خەڵکی بەسەر چەند بەرەیەکدا دابەش ببوون، بەرەیەک دەیووت کارەبا دروستکراوی جنۆکەیە و ئینگلیزەکان توانیویانە جنۆکە لەخزمەتی خۆیاندا بەکار بهێنن، بەرەیەکی تر بۆچوونێکی جیاوازی لەبارەی کارەباوە هەبوو، ئەمان پێیان وابوو کارەباش وەچە دەنێتەوە وەک چۆن نێرو مێ وەچە دەنێنەوە. لەدیدی ئەواندا ئەو گڵۆپە کارەباییانەی هەڵواسراون (مێ)ن، (نێر)ەکانیش لەلای ئینگلیزەکان پارێزراون هەرکاتێک بیانەوێ لەگەڵ مێیەکاندا زاوزێیان پێدەکەن.

بەرەی سێیەم دەیانووت رووناکیی کارەبا لە بروسکەی ئاسمانییەوە وەرگیراوەو ئینگلیزەکان توانیویانە بۆخۆیان راویان بکەن و بیانخەنە زیندانەوە، کە ئێوارەش دادێت بەریاندەدەنە وێزەی گڵۆپەکانەوە، بەرەی چوارەم دەیانووت لە دەریاکاندا باڵندەیەک هەیە رووناکیی تیادایەو ئینگلیزەکان بۆ خزمەتی خۆیان راویان کردووە. ئەو قسەو گفتوگۆیانەی رۆژنامەی العرب بڵاوی

کردبوونەوە دەشێت دروستکراوی خاوەنەکانیان بووبێت، بەڵام تا ئەندازەیەکی زۆر راستییان تێدایە، چونکە لەسەردەمی منیشدا کاتێک گوێم بۆ قسەکانی خەڵکی رادەگرت، بەکەمێک جیاوازییەوە هەمان ئەو شتانەم دەبیست کە رۆژنامەکە باسی دەکات.

لەم بارەیەوە شتێکی سەیر هەیە کە پێویستە بیگێڕمەوە، کاتێک بۆ یەکەمجار پانکەیەکی کارەباییم بینی خۆبەخۆ دەسوڕێتەوە، بەپەلە چوومە لای دایکم و لێم پرسی نهێنیی ئەو ئامێرە سەیرە چییە، وەڵامەکەی دایکم لەناوەرۆکدا هیچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ ئەو لێکدانەوانەی لەزاری پیاوەکانی چایخانەدا گوێم لێدەبوو.

یەکێک لەو پرسیارانەی کە ئەوسا بەردەوام بە مێشکی خەڵکیدا دەهات، ئەمەبوو: هۆی چییە ئینگلیزو فەرەنجییە کافرەکان دەتوانن ئەو داهێنانە سەیرو عەجایبانە دابهێنن، کەچی موسڵمانەکان لە داهێناندا کەمدەست و هەژارن؟

رۆژێکیان لە یەکێک لەو ئێوارانەی باوکم دەیبردم بۆ چایخانە، گوێم لە مشتومڕێکی لەو چەشنەبوو.

یەکێک لە پیاوەکانی ناو چایخانەکە هەوڵی دەدا وەڵامی پرسیارەکە بداتەوەو دەیووت نهێنیی

سەرجەم ئەو داهێنانانە لە قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەرو ئیمامەکانـدا هەیە، بەڵام موسـڵمانەکان لێی غافلگیر بوون و فەرامۆشیان کرد، کەچی فەرەنجە کافرەکان گرنگییان پێداو دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوەی، تا ئەوەی بەجوانی تێگەیشتن و ئەو دەرەنجامە زانستییەیان لێ هەڵهێنا.

ئەم بۆچوونە بەدڵی هەندێ کەس نەبوو، یەکێک لە ئامادەبووان بەرپەرچی دایەوەو بۆچونێکی تری خستەڕوو، ناوەرۆکی بۆچوونەکەی وابوو کە فەرەنج و ئینگلیزەکان ئەهلی دونیان و ئیبلیس لەم دونیادا یارمەتییان دەدات و هەر ئەویش نهێنیی ئەو بەهرەی داهێنانەیان دەداتێ، بەڵام موسڵمانان بەشیان لەو دونیایەی تردایەو، ئەو دونیا لەم دونیا فانییە باشترە.

کەسێکی تر لەولاوە رایەکی تری هەبوو، پێی وابوو ئەفرەنج و ئینگلیز کوڕی سوزانین و زۆڵن، ژنەکانیان بەڕەڵان و تێکەڵی پیاوان دەبن و بێ شەرەف و بێ دینن، سروشتی کوڕی سوزانیش بەو شێوەیە، رێک وەک شەیتان زۆر زیرەک و وریایە، ئەمەیە نهێنیی داهێنانە سەیروسەمەرەکانی ئەوان.

ئەم گفتوگـۆو مشـتومڕانە لەناوەرۆکـدا جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە لەگەڵ ئەو باسانەی

رۆژنـامەی (العـرب) لەبـارەی سەیروسـەمەرەیی کارەبا بـڵاوی دەکـردنەوە، مـرۆڤ وەک پێشـتر ئامـاژەم پێدا ناتوانێت لەشتی تـازە تێبگـات تەنهـا لەمیـانی چەمـکە کۆنەکـانیەوە، لێکـدانەوەیان بـۆ دەکات.

سروشـتی ئەقڵـی بەشـەری بەگشـتی بەو شێوەیەیە ناتوانێت بە رەهایی لە حەقیقەتی شتەکان تێبگـات، بەڵکـو بەپێـی زانیـاری و تێگەیشـتنەکانی خـۆی لێیـان تێـدەگات، ئەمە تەنهـا لای خەڵکـی عەوامدا نییە، بەڵکو لەلای زاناو فەیلەسوفەکانیشدا هەیە.

(کـالڤن) زانـایەکی نـاوداری بـواری فیـزیکەو لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا ژیاوە، کاتێک هەواڵی دروستکردنی فرۆکەی بیست، نکوڵیی کردو پێی وابـوو ئەمە شـتێکی مەحـاڵە، وتـوویەتی: "لەگۆشەنیگای ماتریالیزم، فڕین بەچەند ئامێرێکی قورستر لە هەوا، مەحاڵە. مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت بگاتە ئەو ئاستە". ئەم هەڵوێستەی (کالڤن) جیاواز نییە لەو هەڵوێستەی خوالێخۆشبووی باپیرم کاتێک بۆ یەکەمجار هەواڵی فرۆکەی بیست، دووچاری سەرسوڕمان بوو، وەک پێشتر باسم کرد.

## بەشي سێیەم:
## ئوسمانڵی گلیورلەر

لە دوای کەوتنی بەغدا بەدەستی ئینگلیزەکان، لەنێو خەڵکیدا پروپاگەندەیەک بڵاوبۆوە دەیانووت:"(ئوسمانڵی) واتە عوسمانییەکان، بەم نزیکانە دەگەڕێنەوە بۆ عێراق"، خەڵکێک هەبوون ئەم جۆرە پروپاگەندانەیان بڵاو دەوکردەوە، چونکە بەرژەوەندییان لەتەک سەردەمی عوسمانیدا هەبوو، ئەم جۆرە کەسانە پێیان دەوترا (گلیورلەر) کە وشەیەکی تورکییە واتە گەڕاوەکان (عائیدون).

من لەو رۆژگارەدا ئارەزووی کۆکردنەوەی پارەی کانزایی عوسمانیم هەبوو کە چیتر بەکار نەدەهات، لەلای کەسوکارو خزماندا بەدوای ئەو جۆرە پارەیەدا دەگەڕام و برێکی زۆرم کۆکردبووەوە، رۆژێکیان لە دوکانەکەی باوکمدا دانیشتبووم کەسێک بەوێدا تێپەڕی و مۆژدەی ئەوەی بە باوکم دا کە بەم نزیکانە عوسمانییەکان دەگەڕێنەوە بۆ عێراق. باوکم ئاوڕێکی لێدامەوەو پرسیاری ئەوەی لێکردم چەندم لەپارەی عوسمانی کۆکردۆتەوە، وتی لەئەگەری گەڕانەوەی عوسمانییەکاندا سوودی لێدەبینیت. دڵم بەم قسەیە خۆش بوو، بەڵام بەداخەوە ئەم خۆشییە هیچ

سوودێکی نەبوو، لەباوکمدا تێبینیی ئەوەم کردبوو کە چەشنە ململانێیەکی دەروونیی لەبەرامبەر عوسمانییەکان و ئینگلیزەکاندا هەبوو. باوکم لەسەرێک زۆر ئیماندار بوو و بەئەندازەیەکی زۆر خەریکی خوداپەرستی بوو، بەو پێیە دەبوایە لایەنگری عوسمانییەکان بێت بەحوکمی ئەوەی دەوڵەتێکی دینی بوو، بەڵام لەسەرێکی تر نەهامەتی و ئازارێکی زۆری بەدەستی عوسمانییەکان چەشتبوو وای لێکردبوو رقێکی قووڵ و شاراوەیان لەئاستدا هەڵبگری.زۆربەی خەڵکی وەکو باوکم وابوون بەڵام لە رێژەی ئەو ململانێ دەروونییەدا جیاواز بوون، کەسی وا هەبوو فاکتەرە ئاینییەکەی تیادا بەهێزتر بوو وەک لە فاکتەرە دونیاییەکەی، هەشبوو بەپێچەوانەی ئەمە بوو.

### لە دیاردەکانی ستەمی عوسمانی

جەور و ستەم لە سەردەمی عوسمانیدا گەیشتبووە پلەیەک بەدەگمەن زوڵمی وا لەهیچ سەردەمێکی تردا هەبووە.دەوڵەتی عوسمانی بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی پێی دەوترا (پیاوە نەخۆشەکە)، چونکە دەوڵەتێکی لاوازو گەندەڵ بوو. گروپی 'ئیتیحادو تەرەقی' لەدوارۆژەکانیدا هەوڵیان دا بیبوژێننەوە، بەڵام لەبری ئەوە خستیانە نێو جەنگێکی گەورەوە کە بەتەواوی لەناوی بردن.

لەسـەردەمی منداڵیمـدا گـوێم لەخەڵكـی دەبـوو باسی گەندەڵی و زوڵم و زۆری عوسمانییان دەكرد كە ئەو زوڵمە چۆن بەشێوەیەكی فراوان و بەرین بڵاو ببۆوە. دواتر كە بیرەوەرییەكانی هەندێ لەو كەسانەم خوێندەوە كە لەوكاتەدا ژیابوون، بۆم دەركەوت ئەو بـــارودۆخەی خەڵكـــی عەوام لە دانیشتنە تایبەتییەكانی خۆیانـدا باسیان دەكرد، هەمان ئەو بارودۆخەیە كە لە بیرەوەرییەكاندا باس كـراوە. نەنگـی و ئابڕوچوونەكـانی سـەردەمی عوسمانی ئێجگار زۆرن و زەحمەتە بتوانین كۆیان بكەینەوە، بەڵام دەتوانم لێرەدا هەندێكیان باس بكەم وەك ئەوەی لە زمـانی خەڵكیدا بیستوومە یان لە بیرەوەرییەكانی ئەو كەسانەدا خوێندوومەتەوە كە لەو سەردەمەدا ژیابوون.

دەوڵەتی عوسمانی بەشێوەیەكی رێك و پێك و لەكاتی خۆیدا موچەی بەسـەر فەرمانبەرەكانیدا دابەش نەدەكرد، جاری وا هەبووە ماوەیەكی زۆر تێپەڕیوە بێئەوەی سـەربازو فەرمـانبەران مـوچە وەربگرن، ئەمە وای لە سەربازەكان كرد هەندێجار پەلاماری بازاڕەكان بدەن و تاڵانی بكەن، ئەوەی كە خەڵكـی پێیـان دەووت (فەرهـود)، لەولاتـر فەرمـانبەران كـاری هاوڵاتیـان جێبەجێ نەدەكرد تەنها ئەگەر بەرتیلێكیان پێ بدانایە سا راستەوخۆ بوایە یان بە نهێنی و ژێر بەژێر.

مەدام دیۆلافرا لە بیرەوەرییەکانیدا دەگێڕێتەوە، لەساڵی ١٨٨١دا لەتەک مێردەکەیدا سەردانیی شاری بەسرە دەکەن، ئیدی باسی ئەو شوێنگە تەندروستییە دەکات کە پێیاندەووت کەرەنتینە (محجر صحی) و دەوڵەت بۆ ئەو کەسانەی دانابوو کە لەدەرەوەی عیراق دەهاتن و چۆن ئەمان توانییان هەڵبێن و خۆیان دەرباز بکەن. ئەو باسی خەڵکی بەسرە دەکات چۆن فەرمانبەرانی ئەوی ئەو شوێنەیان بۆ راوکردن بەکاردەهێناو پارەیان لەو گەشتیارانە وەردەگرت کە لەوێدا دەمانەوە. ئەوان بەرامبەر بە بەرتیلێک ئینجا ڕێگەیان بە گەشتیاران دەدا شوێنەکە بەجێبهێڵن، یان هەندێجار دەستیان بەسەر پارەکانیاندا دەگرت، یان بە نرخێکی گران خۆراکی ماوە بەسەرچوویان پێ دەفرۆشتن.

دەوڵەتی عوسمانی لەسەردەمی جەنگدا دراوێکی کاغەزیی دەرکرد پێیان دەووت (نۆت)، خەڵکی بەهۆی ئەو دراوەوە دوچاری ناخۆشییەکی زۆر بوون، چونکە نرخی ئەو دراوە لە بازاڕدا دەیکردە چارەکێکی نرخە فەرمییەکەی، زۆرجار وا ڕێکدەکەوت کە فەرمانبەرێک یان ئەفسەرێک لەبازاڕدا شتێکی دەکڕی و ئەو جۆرە پارەیەی دەداو داوای باقیەکەیشی دەکرد، دوکاندارەکەش لەئاستی ئەو پارە بێنرخەدا دوچاری ئیحراجبوون

دەبوو و نەیدەزانی چی بکات، هەم شتەکەی دەداتی و هەم دەبێ باقیشی بداتەوە، بۆیە زۆرجار فرۆشیارەکە لە کڕیارەکە دەپاڕایەوە کە شتەکە بە خۆڕایی و لەڕێی خوا ببات، یان بەقەرز بیبات بەو هیوایەی بەڵکو ڕۆژێک ئەو قەرزە بداتەوە.

بەسەربازیکردنی زۆرەملێ لەسەردەمی عوسمانیدا یەکێک بوو لەو کێشە پڕ لە نەهامەتییانەی ڕووبەڕووی خەڵکی دەبووەوە، هەر خێزانێک یەکێک لە ئەندامەکانی دوچاری سەربازیکردنی زۆرەملێ ببوایەتەوە ئیدی گریان و ناڵەو فیغان لەناو خێزانەکە بەرز دەبۆوە، چونکە دڵنیابوون زۆربەی ئەوانەی ڕەوانەی بەرەکانی جەنگ دەکرێن، ئەوا بەمسۆگەری دەمرن و تیادەچن، سا لەبرسا بێت یان لەسەرما یان بەهۆی برینداربییەوە کە چارەسەر نادەکران. خەڵکی لەو بوارەدا ئەزموونی تاڵیان چەشتبوو بەدەست ئەو جەنگانەی لەرابردوودا دەوڵەت هەڵیدەگیرساندن و خەڵکێکی زۆری تیادا چوون.

گرفتی فەرمانگەی بەسەربازیکردن ئەوەیە کە بەیەکسانی و دادپەروەری مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا ناکات، بەرتیل و واستە ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو، تەنها کوڕانی کەمدەرامەت و هەژار بەڵای سەربازییان بەسەردا دەسەپێنرا، کەچی کوڕانی

دەوڵەمەندو نـاودارو دەستڕۆیشتوو، بەشێوەیەک لەشێوەکان، دەرباز دەبوون

فەرمانگەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەکاتی جەنگدا بەنـاوی (خەرجیـی جەنـگ)ەوە دەسـتیان بەسـەر شتومەک و کەرەستەی خەڵکیدا دەگرت، بەبیانووی ئەوەی بۆ جەنگەکە پێویستییان پێی هەیە، دەوڵەت بەڵێنێکـــی دەســـتوخەتیی دەدا بەخـــاوەنی ئەو کەرەستەو شتومەکانە کە لەپاش کۆتاییهاتنی جەنگ پـارەی ئەو شـتانەیان دەدەنـی. بەڵام خەڵکـی دڵنیـابوون لەوەی هیچیـان دەسـت نـاکەوێتەوە، چـونکە لەرابـردوودا بە ئەزمـوون ئەوەیـان بـۆ دەرکەوتبـوو، ئەمە جـگە لەوەی ئەو ئەفسـەرو فەرمـانبەرانەی راسـپێردرابوون بە کـۆکردنەوەی (خەرجیـی جەنـگ)، دەرفەتەکەیـان دەقۆسـتەوەو پارەکانیـان بـۆ خۆیـان گـل دەدایەوە، هەنـدێکیان بەرادەیەکی زۆر دەوڵەمەند بوون.

### لەنێوان دوو پاڵنەردا

بەهـۆی ئەو نەهامەتییـانەی خەڵکـی بەدەسـت دەوڵەتـی عوسـمانییەوە دوچـاری ببـوون، وایـان لێهـاتبوو لەنێـوان دوو پـاڵنەری دژ بەیەکـدا بوودەسـتن، وەک پێشـتر ئامـاژەم پێدا، یەکێـک لەو پـاڵنەرانە دینـی بـوو کە وای لێـدەکردن لایەنگـرو

هاوسۆزی دەوڵەت بن لە جەنگەکەیدا دژی کافران، بەلام پاڵنەرەکەی دی دونیایی بوو وای لێدەکردن رقیان لێبێت و کافرانیان پێ باشتر بێت.

ئەوەی لێرەدا شایستەی وتنە ئەوەیە کە زانایانی ئایینی یان پیاوانی ئایین، لەساتەوەختی جەنگدا، بانگەشەی جیهادیان دەکرد دژی ئینگلیزەکان و بۆ لایەنگریی دەوڵەت، ئەمانە بەوەندە نەوەستان تەنها بانگەشەی جیهاد بکەن، بەڵکو خۆیشیان دەچوونە نێو سوپای عوسمانییەوەو لەبەرەکانی شەڕدا بەشدارییان دەکرد، ئەمە وای لە ژمارەیەکی زۆری سەربازەکان کرد هەست بە ململانێی دەروونی بکەن، نەیاندەزانی چی بکەن، ئاخۆ بەدەنگ بانگەشەی جیهادەوە بچن و لەپێناوی خوادا خۆیان فڕێ بدەنە نێو مەرگەوە، یان لەدەستی دەوڵەتێکی ستەمکارو گەندەل هەڵبێن و چیتر سەربازی نەکەن.

لەبەشی یەکەمدا باسی ئەوەم کرد چۆن نەجەف، لەساتەوەختی جەنگدا یاخیبوونی لەدژی دەوڵەتی عوسمانی راگەیاندو بوو بە پەناگەیەک بۆ ئەو کەسانەی لەهەموو لایەکی عێراقەوە لەدەست سەربازی هەڵدەهاتن، ئەمە سەرباری ئەوەی نەجەف ئەوساو ئێستاش، شوێنێکی ئاینیی گەورەیە، زانایانی ئایینی ئەو شارە پێشڕەویی بزووتنەوەی جیهادیان دەکرد بۆ سەرخستنی

دەوڵەتی عوسمانی، باشە چۆن دەکرێ گونجانێک بکرێت لەنێوان ئەو دوو ڕەوتە دژ بەیەکەدا؟

پاش ماوەیەکی زەمەنی بۆم ڕەخسا ئەو پرسیارە ئاراستەی باوکم بکەم، وەک پێشتر وتم باوکم هەڵاتووی سەربازی بوو و پەنای بۆ نەجەف بردبوو، هاوکات کەسێکی ئایینپەروەر بوو و ڕێساکانی زانایانی ئایینی جێبەجێ دەکرد.

وەڵامی باوکم ئەوەبوو دەیووت دەوڵەتی عوسمانی لەڕوخسارو رووکاردا دەوڵەتێکی ئایینی بوو، بەڵام لەڕاستیدا وانەبوو، ئیدی باوکم باسی ئەو نەگبەتی و کارەساتانەی بۆ دەکردم کە خۆی و هەزاران کەسی دی، لەسایەی دەوڵەتی عوسمانیی بەناو ئیسلامی، گیرۆدەی ببوون. یەکێک لەو شتانەی بۆی باس دەکردم دۆخی دەوڵەمەندان و دەسترۆیشتووان بوو ئەوانەی لە کازمیەدا تەجنیدو بەسەربازیکردن دەیگرتنەوە، چۆن توانییان خۆیان دەرباز بکەن، یان ڕۆڵەکانیان لەجێگایەک دادەنران دوور بوو لە بەرەکانی جەنگ و مەترسییەکانی جەنگ. پاشان پێی وتم: ئایا دەتەوێ لەپێناوی دەوڵەتێکدا، کە بەوشێوە ئابڕووبەرە، جیاوازی لەنێوان خەڵکیدا دەکات، خۆم بهاویمە نێو مەرگەوە؟ دەوڵەتێکی ئیسلامیی ڕاستەقینەم بدەرێ بزانە چیی بۆ دەکەم!!

ئەم راڤەکــردنەی لە بــاوکمەوە بیســتم وەک چارەســەریک وابوو بۆ ئەو ململانــێ دەروونییەی خۆی و کەسانی دی دوچاری ببوون .

جــاریکی تــر بــۆم رەخســا هەمــان پرســیار ئاراســتەی یەکێــک لە زانایــانی ئــایین بــکەم کە بەشــداریی لە بــزووتنەوەی جیهــاد کردبــوو، ئەو بەشێوەیەکی تر وەڵامی دامەوە، ئەو پێی وابوو ئەو زانــا ئایینیــانەی بانگەشــەی جیهادیــان دەکــرد لەراســتیدا ئەرکــی ســەرشــانی خۆیــان جێبەجــێ کردووە، ئەو ئەرکەی ئایین دەیخوازێت، بەو پێیەی دەوڵەتی عوسمانی نوێنەرایەتیی ئیسلام دەکات و دەوڵەتیش لەحاڵەتی جەنگدایە لەدژی کافران، بۆیە دەبــوایە بەهەرشــێوەیەک بێــت ئەو دەوڵەتە سەربخرێت.

لێرەدا نابێ ئەوەمان لەیاد بچێ کە زانایانی ئــایین دوچــاری گرفــت و نەهامەتییەکــانی بەسەربازیکردن نەبوون بەو شێوەیەی خەڵکی و بەتــایبەتی هەژاران دەرگیــری ببــوون، لەراســتیدا زانایــانی ئــایین و پیــاوانی ئــایین لە خزمەتــی سەربازی بەخشرابوون، کاتێکیش بەرەو بەرەکانی جەنــگ دەچــوون، دوور بــوون لە مەودای تــۆپ و تفەنگ و گوللە، دەوڵەت کۆمەڵێ ئیمتیازاتی تایبەتیی بە خۆیــان و بە دەســت و پێوەنــدو کەســە نزیکەکانیــان بەخشــیبوو، ئەمە وای لە زۆر کەس

کـــرد پەیوەنـــدی بە پیـــاوانی ئـــایینەوە بـــکەن و لەخزمەتی ئەواندا بن تا لەدەست سەربازیکردن قوتاریان ببێت.

جارێکیـــان بـــاوکم چیرۆکێکـــی بـــۆ گێـــڕامەوە پەیوەندیی بەم بابەتەوە هەیە، کورتەی چیرۆکەکە بەمجـــۆرەیە: کاتێـــک لە ســـەرەتای جەنـــگەکەدا سەربازیکردنی بەسەردا سەپێنرا، خۆی و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، یەکەمجار بردنیان بۆ گۆڕەپانی قشڵەی بەغدا تا گوێ لەو وتارە ئایینییە بگرن کە دادوەری بەغدا بۆی دەدان، کاتێکیش گەیشتنە شوێنی مەبەست، بینییان چۆن دادوەر وتارێکی زایەڵەداریـــان پێشـــکەش دەکـــات و بە دەنـــگ و نەغمەیەکـــی وروژێـــنەر قســـە دەکـــات و باســـی پێویستیی خۆبەختکردن دەکات لەپێناو پاراستنی ئایین لە مەترسییەکانی کافران. باوکم دەیووت ئێمە بەتەواوی دەمانزانی کە ئەم دادوەرە شەفاعەتی بۆ کوڕەکانی خۆی و خزمەکانی کردبوو تا نەچن بۆ سەربازی و لەبەڵای تەجنید رزگاری کردبوون. ئەمە واتە دادوەرەکە داوای لە خەڵکی دەکرد گیانی خۆیان بەخت بکەن لەپێناوی خوادا، کەچی لەولاتر کوڕو خزمەکانی نەدەنارده بەرەی جەنگەکـــان و دەبوایە ئەوان لە سەربازی ببەخشرانایە!! باشە بۆچی؟ ئەم نیفاقە لەپای چی؟؟

## بەشی چوارەم:
## بەهەشت (خان جغان) نییە

لە بەشەکانی پێشووی ئەم بیرەوەرییانەدا باسی ئەو قۆناغەی منداڵی و لاویم کرد کە تیایدا گەشەم کردووە، ئەویش قۆناغێکی ئاسایی نەبوو و خەڵکی هەندێ شتیان تیا بینی پێشتر شتی وایان نەدیبوو و پێی رانەهاتبوون، ئەمە وای لێکردن هەمیشە پرسیار دەربارەی ئەو شتە تازانە بکەن و مشتومڕی لەسەر بکەن، کە بەهۆی ئەمانەوە دوچاری جۆرێک لە ململانێی دەروونی ببوون. لێرەدا دەبێ ئەوە بڵێم ئەو ژینگە کۆمەڵایەتییەی تیایدا گەشەم کرد ژینگەیەکی ئاسایی نەبوو، بەڵکو پڕ بوو لە سەرەتای گۆڕانکاری، کە پرسیارکردنی تیادا وروژاندم و منیشی دوچاری ململانێی دەروونی کرد.

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەم باسی ئەو بارودۆخ و هەلومەرجە بکەم کە تیایدا گەورەبووم، هەم لە ماڵەوەدا و هەم لە گەڕەک و هەم لە شارۆچکەکەمدا، چۆن ئەمانە، کەم و زۆر، کاریان کردە سەر پێکهاتەی کەسایەتیم.

## بارودۆخی ماڵەوە

من تاقە منداڵی دایک و باوکم بووم، نۆ برای ترم لەپاش لەدایک بوونیان بە ماوەیەکی کەم مردن. مردنی منداڵ لەو رۆژگارەدا زۆر بوو، بەتایبەتی لە نێوەندی هەژاراندا. ئێمە لە خانوویەکی ئاسایی و خاکەڕادا دەژیاین، بەڵام خانووەکەی ئێمە لەتەنیشت خانوویەکی زۆر خۆش و گەورەدا بوو، ئەویش خانووی سەرۆکی شارەوانی بەڕێز جەعفەر عەتیفە بوو (پێیان دەووت سەید جەعفەر) کە یەکێک بوو لە هەرە دەوڵەمەندەکانی شارۆچکەکەو بگرە لە هەمووان دەوڵەمەندتر بوو. ئەوەی جێی سەرنج بوو دەروازەی خانووەکەی ئێمەو خانووی دراوسێ دەوڵەمەندەکەمان هاوبەش بوو. هەندێ کەس کە دەیانبینیم لەو دەروازە هاوبەشەوە دەچوومە ماڵەکەی خۆمان، وایاندەزانی منیش لەمنداڵانی دراوسێ دەوڵەمەندەکەم. بەڵام بۆشایی نێوان ماڵی ئێمەو ماڵی ئەوان، لە ئاستی بژێویدا، زۆر گەورە بوو.

بەڕێز سەی جەعفەر سێ جارییە (کەنیزەک)ی رەشپێستی لە ماڵەکەیدا هەبوو، یەکێک لەو جارییانە قەڵەو بوو و زۆریش رەشپێست بوو، کاری ئەو بریتی بوو لە بەڕێوەبردنی کاروباری

مەتبەخ و چێشتلێنان. ئەم ژنە قەڵەو و ڕەشپێستە بۆ دایکمی باس کردبوو کە کاتی خۆی لە ئەفریقیا لەخێزانەکەیان فڕاندبوو کە هێشتا منداڵ بوو و لە حیجازدا فرۆشرا، بەڕێز جەعفەر لەکاتی فەریزەی حەجدا ئەو کچە منداڵەی لەوێ کڕیبوو. بەلام دوو جارییەکەی تر ڕەشیی پێستیان لەو کەمتر بوو و کەمێک جوان و ڕێکئەندام بوون، کاری ئەمان تایبەت بوو بە مەسەلە تایبەتییەکانی بەڕێز جەعفەرو بە شێلانی شان و ملی.

سەید جەعفەر وەک پیاوماقولانی تری ئەو ڕۆژگارە شارەزا بوو لە هونەری ماستاوکردن بۆ دەسەلاتداران، ئەمەش هونەرێک بوو، ئەو کاتە زۆر پێویست بوو بۆ پیاوماقولان، هێشتا کاروباری ئینگلیزەکان بەتەواوی جێگیر نەبوو کە سەید جەعفەر خوانی گەورەو چەوری بۆ دەڕازاندنەوەو دیاریی گرانبەهای پێشکەش دەکردن، من لە خەلکیی دیکەوە زانیم کە لەرابردوودا ئەم کارەی لەگەل عوسمانییەکانیشدا دەکرد.

ئیمەی منداڵ دەمانبینی گەورەپیاوانی ئینگلیز دەهاتن بۆ ماڵی سەی جەعفەر، یان دەچوونە بیستانەکەی کە دوور نەبوو لە ماڵەکەیەوە، ئیمەش بەدوای ئۆتۆمۆبیلەکانیاندا رامان دەکرد، تیبینیمان

کرد لەنێو ئینگلیزەکاندا ژنێکی باریک و ڕێکپۆش هەیە کە دواتر زانیمان ئەمە (مسز بێل)ە، ئەم ژنە سکرتێری ڕۆژهەڵاتیی مەندوبی سامی بوو، دەمبینی دەچووە ماڵی سەی جەعفەرو لەگەڵ هەردوو کچەکەیدا (فەرحە) و (نەشیمە) بە زمانی عەرەبی قسەی دەکردو بۆیان پێدەکەنی.

کاتێک دواتر کە گەورەبووم و نامەکانی مسز بێلم خوێندەوە، بۆم دەرکەوت ئەم ژنە ڕێزو حورمەتێکی زۆری سەی جەعفەری لابوو و بەیەکێک لە پشتیوانانی حوکمی ئینگلیزی لەعێراقدای دادەنا. نەیدەزانی کە خودی ئەم پیاوە پێشتر پشتیوانی حوکمی عوسمانییەکان بوو، یان لەوانەشە زانیبێتی و چاوپۆشی کردبێت.

یەکێک لەو شتە سەیرانەی دەگێڕدرێتەوە، دەڵێن لەکاتی پاشەکشەی عوسمانییەکان لە بەغدا و بەرلەوەی بکەوێتە دەستی ئینگلیزەکان، سەی جەعفەر خۆی و چەند پیاوماقوڵێکی تری شارۆچکەکەمان، هاتنە دەرێ بۆ ماڵئاواییکردن لە سەرکردەکانی سوپای عوسمانی، بەو سەرکردانەیان دەووت: "لەدوای ئێوە، ئێمە دوچاری زوڵم و ستەم دەبین، داوا لە خوا دەکەین بەسەر کافراندا سەربکەون و جارێکی تر بگەڕێنەوە لامان"،

بەلام هەر خــودی ئەو پیاوماقولانە، بــۆ رۆژی دواتــرو پــاش گرتنــی بەغــدا لەلایەن ئینگلیــزەوە، چوبــوون بــۆ پێشــوازیی ســەرکردەکانی ســوپای ئینگلیــز، لای ئەمــانیش قســەیەکی پێچەوانەیــان کــردووەو خۆشــحالّیی خۆیــان دەربڕیــوە بەهــاتنی ئینگلیزەکان و رزگاربوونیان لە ستەمی عوسمانی.

ئەم گــۆڕینی هەلّویســتە عەجــاییبە لە نەریتــی خەلّکی ئەوکاتەدا شتێکی سەیروسەمەرە نەبووە، بگــرە ئەمە لەتێڕوانینــی زۆربەیانــدا رەفتــارێکی ئاســایی و پێویســت بــوو. شــایانی باســە ئەو پیاوماقولّەی لەسەر ماستاوکردن بۆ دەسەلاّتداران راهاتبێ، ئەوا لەئاستی ئەو کەسانەشدا کە لەرووی کــۆمەلایەتییەوە لەخــۆی نزمتــر بــوون، فیــزو لەخۆبــاییبوونی دەنوانــد. مــن ئەمەم بە روونــی لە رەفتاری سەی جەعفەردا بینی لەبەرامبەر خەلّکی هەژار کە دراوسێ و خەلّکی شارۆچکەکەی بوون. ئەو بە لــــووت بەرزی و فیزیکــــی زۆرەوە بە شــەقامەکاندا دەرۆیشــت، بەدەگمەن نەبێ سلاوی لەکەس نەدەکــرد، دەبــوایە خەلّکــی دیــکەش بــۆی هەســتانایەتە ســەرپێ و بــۆی بچەمانــایەتەوەو سلاویان لێ بکردایە.

ئەو بارودۆخەی خەلکی بۆ ماوەیەکی زەمەنیی درێژ تیایدا ژیان، ناچاری کردبوون بەو شێوەیە رەفتار بکەن، هەر یەکێک لەوانە ماستاوی بۆ لەخۆی بلندتر دەکرد، فیزو لەخۆباییبونی لەبەرامبەر کەسانی لەخۆی نزمتر دەنواند، ئەو لەکاتی ماستاوکردندا پارێزگاریی لە بەرژەوەندیی خۆی دەکردو لەکاتی لەخۆباییبوونیشدا پارێزگاریی لە شوێنگەکەی خۆی دەکرد.

**بارودۆخی گەڕەك**

مالی ئێمە کەوتبووە نێوان دوو گەڕەکی جیاواز لەرووی پێکهاتەی کۆمەلایەتی و بەهای کۆمەلایەتیی باوی ئەوکاتە، ئەو دوو گەڕەکەش بریتی بوون لە (گەڕەکی شێوخ) و (گەڕەکی ئەنبارییەکان)، دەروازەی خانووەکەی ئێمە کەوتبووە گەرەکی شێوخەوە، بەلام پەنجەرەکانی پشتی خانووەکەمان دەیڕوانییە کۆلانێکی گەڕەکی ئەنبارییەکان، منیش هەندێ جار لەگەل منالانی ئەم گەرەک یاریم دەکردو هەندێ جاری دیش لەگەل منالانی ئەو گەڕەک.

لەرووی بەهای کۆمەلایەتییەوە جیاوازییەکی گەورە هەبوو لەنێوان ئەو دوو گەڕەکەدا، لە

گەڕەكی ئەنبارییەكاندا بەهاو نەریتی عەشایەری باو بوو، وەك سفوری ژنان (واتە بەبێ عەباو پەچە)و هەروەها نەریتی تۆڵەسەندنەوە(الثأر)و شتنەوەی شوورەیی (غسل العار). بەڵام گەڕەكی شێوخ وەك گەڕەكە دێرینەكانی دی، ژنان تیایدا حیجابێكی زۆریان دەپۆشت و بەدەگمەن رووداوی تۆڵەسەندنەوەو شتنەوەی شوورەیی و شتی لەو چەشنەی تیادا رووی دەدا.

هۆكاری جیاوازیی نێوان ئەم دوو گەڕەكە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە خەڵكی گەڕەكی ئەنبارییەكان ماوەیەكی زۆر نەبوو لە كازمیەدا نیشتەجێ ببوون، پێشتر لە گوندەكانی دەوروبەری ئەنباردا دەژیان كە دەكەوتە سەر رۆخی فورات، لێرەشەوە ئەو ناوەیان بەسەردا برا، بۆیە ئەمانە لە دابونەریتی لادێیی و خێڵەكی و عەشایەریدا كۆنەپارێز بوون. ئەم سیفەتە تەنها لە گەڕەكی ئەنبارییەكاندا نەبوو، بەڵكو زۆر گەڕەكی دی لە بەغدا هەبوون هەڵگری هەمان سیفەت بوون. لەراستیدا هەموو ئەو گەڕەكە كەنارانەی دەوری بەغدایان دابوو لەهەردوو لای كەرخ و رەسافەدا، لەو چەشنە بوون، ئەمانە لەپاش ئەو گرانەتا (تاعون)ە توندەی كە لەساڵی ١٨٣١دا بەغداو

کازمیەی تەنی، روویان کردە ناوجەرگەی شارەکە، ئەو نەخۆشییە ژمارەیەکی زۆری خەڵکی لەناوبرد.

گرنگترین ئەو شتانەی لەمنداڵیمدا سەرنجی رادەکێشام، ئەو جیاوازییە روونە بوو لەنێوان رەفتاری ئافرەتی ئەنباری و رەفتاری ئافرەتانی گەرەکەکانی تر لە کازمیە، ئافرەتی ئەنباری بەشێوەی لادێیی سفوور بوو واتە عەباو پەچەی نەدەپۆشی، ئەو شێوەیەی ئیسلام فەرمانی کردبوو، واتە دەرخستنی روخسارو هەردوو دەست بەبێ رازاندنەوە، بەڵام لە کۆڵانەکانی تردا ئافرەت کاتێک دەهاتە دەرەوە دوو عەبای دەپۆشی، یەکێکیانی دەخستە سەر شانی و ئەوی دیکەیشیانی دەخستە سەری، بەعەبای دووەمیان رووخساری خۆی دەشاردەوە، تەنها کونێکی بچوکی دەهێشتەوە تا لەوێوە دەرەوە ببینێت و رێگاکە بزانێت.

سفووریی ئافرەتی ئەنباری هەروەک سفووریی ئافرەتی لادێیی وابوو، بەڵام زۆرجار دوچاری نەریتی شتنەوەی شوورەیی دەبوونەوە، واتە نەریتی کوشتنی ژنان لەکاتی گومانکردن لە رەفتاریدا، ئەم نەریتە لە گەرەکەکانی تردا باو نەبوو، کەچی لەگەرەکی ئەنبارییەکاندا بەئەندازەیەکی زۆر باو بوو.

جارێکیـــان لەو گەڕەکەدا پروپاگەنـــدەی خـــراپ لەسەر ژنێک دەکرا، ئەو ژنە خزم و کەسی نزیکی وای نەبـوو تـا بتـوانن بیکـوژن، تەنهـا برایەکـی بچـووکی هەبـوو نەگەیشـتبووە تەمەنـی بـاڵقبوون (هەرزەکـــاری)، ئیـــدی پیاوەمـــاقوڵانی ئەو گەڕەکە کۆبوونەوەو دەربارەی ئەم مەسەلەیە قسەیان کرد، بڕیاریـــان دا بـــراکەی رابســـپێرن بە کوشـــتنی خوشکەکەی، بەڵێنیشیان پێدا کە یارمەتیی بدەن و پارێزگاریی لێبکەن. ئەو برایە کارەکەی ئەنجام داو خـــۆی ڕادەســـتی پـــۆلیس کـــرد، پیاوەمـــاقوڵانی گەڕەکەکەش لەگەڵیـــدا رۆیشـــتن بـــۆ یارمەتیـــدانی، کاتێـک دادگـا حـوکمی بەنـدکردنی لە بەنـدیخانەی نەوجەوانانـدا بەسەردا سـەپاند، بەهەمـوو شـێوەیەک یارمەتییـــان دەدا، پـــاش ئەوەی لە بەنـــدیخانە ئـــازاد کـــرا، بـــوو بە کەســـێکی رێـــزدارو بەشـــێوەی جۆراوجۆر یارمەتییان پێشکەش دەکرد.

یەکێـــک لەو شـــتە ســـەمەرانەی تـــر کە لەو رۆژگـــارەدا لە کـــۆڵانی ئەنبارییەکانـــدا بینـــیم، ژنێـــک بەشـێوەی لادێییانەی بـاو سـفوور بـوو وەک ژنـانی تری ئەو گەڕەکە، بەڵام کچەکەی بوو بە لەچکپۆش (مـوحەجەبە) چـونکە شـووی بە پیاوێـک کـرد لە گەڕەکێکـی دی کە حیجـابی تیـادا بـاو بـوو، پـاش

تێپەڕبوونی ماوەیەکی زەمەنی بینیم کچەزاکەی بەتەواوی خۆی سفوور کردبوو لەشێوەی سفووری نوێ، واتە جگە لەوەی روخسارو دەموچاوی دیاربوو، قۆڵ و گەردنیشی ئاشکرا کردبوو، چونکە کچەزاکەیشی وەک کچانی تری ئەو نەوەیە کەوتبوونە ژێر کاریگەریی مۆدێلی نوێوە، ئەم کچەزایە بیری چوو دایک و نەنکی چییان دەپۆشی.

ئەم گۆڕانکارییە لە هەلومەرجی ژیانی ژنان، هەمان ئەو گۆڕانکارییەی دەنواند کە بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵگەی عیراقیی گرتبۆوە، هەردەشبوو ئەم گۆڕانکارییانە پڕ بن لە گرفت و قەیران وەک لەبەشەکانی تردا باسی دەکەین.

**بارودۆخی شارۆچکەکە**

شارۆچکەی کازمیە کە تیایدا گەورەبووم، بەدووری پێنج میل دەکەوتە باکوری بەغدای پایتەخت، لەنێوان کازمیەو بەغداشدا سکەی عارەبانە هەبوو کە ئەسپ رایدەکێشاو پێیان دەووت (ترامواى)، ماوەی نێوان ئەو دوو شارە بە ترامواى نزیکەی چل خولەک بوو .

کاتێک لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە بەراوردی نێوان کــــازمیەو بەغــــداد دەکەیـــن، بۆشـــاییەکی گەورە دەبینین، کازمیە مەزارێکی ئایینییە، لەهەموو لایەکی عێراق و دنیای شیعیدا سەردانیی دەکەن، چەندین زانای ئاینیی ناودارو قوتابخانەی ئاینیی تێدابوو، بەڵام بەغداد سەرباری ئەوەی پایتەختی وڵات بوو، ســـەنتەرێکی شارســـتانیش بـــوو کە بیـــرو هـــزرو سیستمە نوێیەکانی تیادا گەشەی دەکرد.

کــازمیە یەکـێکە لە چـوار شـوێنە پیرۆزەکـانی عێراق، بەڵام لە سێ شوێنە پیرۆزەکەی دی لەوەدا جیـاواز بـوو کە زۆر نزیـک بـوو لە بەغـداوە، ئەمە وای لێکردبـوو ببێتە شـوێنێک بـۆ ململانێی نێوان کۆن و نوێ، یان ئایین و شارستانیەت، من خۆم لەو ململانێیەدا دوچاری نەهامەتی و کێشـەی زۆر بووم.

ژمـارەی دانیشـتوانی بەغداد ئەوکاتە دەگەیشـتە نـــزیکەی دوو ســـەد ۲۰۰ هەزار کەس، کەچـــی ژمارەی دانیشتوانی کازمیە نزیکەی پانزە ۱٥ هەزار کەس بـوو، خەڵکـی کـازمیە بەو شـێوەیە وەسـفی بەغدایان دەکرد کە شـارێکە فیل تیایدا ون دەبێت، لای ئەوان واباو بوو فیل ڕێگەی خۆی ون ناکات، کەچـی لە بەغـدادا بەهـۆی بەرفراوانـی و زۆریـی

ڕێگاوبان و گەڕەک و کۆڵانەکانی، ڕێگاکەی لی تێک دەچێ و ون دەبێ.

باوکم لە منداڵیمدا لەگەڵ خۆیدا دەیبردم بۆ بەغدا بۆ سەردانی هەندێ لە زێڕینگەرەکان، ئەو دەمە زێڕینگەرەکان هەموویان لە یەک خاندا کۆببوونەوە، ئەو خانە دەکەوتە لای ڕەسافەوە نزیک پردە کۆنەکەو پێیان دەووت (خان جغان) کە خانێکی ناودار بوو و ژمارەیەکی زۆر دوکانی تێدابوو کە تایبەت بوون بە زێڕینگەرەکان و هەموویشیان جولەکە بوون.

یەکێک لەو پەندانەی ئەوسا لەنێو خەلکیدا باو بوو دەیانووت: (بەهەشت خان جغان نییە- الجنة مو خان جغان)، مەبەستیان ئەوەبوو بەهەشت بۆ هەموو کەسێک کراوە نییەو هەموو کەسێک ناتوانێ بچێتە ناوی، بەپێچەوانەی خان جغان کە هەموو کەسێک خۆی تێدەکات، بەهەشت تایبەتە بە توێژێکی دیاریکراو نەک بۆ هەموو کەسێک. جارێکیان لە باوکمم پرسی ئەو توێژە کامەیە کە تەنها ئەوان مافی ئەوەیان هەیە بچنە بەهەشت؟ وەلامی دامەوەو وتی: (ئێمە)، بێگومان من باوەڕم بە وەلامەکەی باوکم کرد، دواتر بۆم دەرکەوت کە هەموو توێژێک لە خەڵکی و لەهەموو سوچێکی

جیهاندا باوەڕیان وایە تەنها ئەوان مافی ئەوەیان هەیە بەبێ مەرایی بچنە بەهەشتەوە. لێرەدا ئەم وتەیەی قورئان راستە کە دەڵێ: (کل حزب بما لدیهم فرحون).

وەک پێشتر ئاماژەم پێدا باوکم زۆر ئایینداربوو. هۆگری خوێندنەوەی کتێبی کۆن بوو، هەروەک بەتوندی رەخنەی لە بیری نوێ دەگرت، بەتایبەتی ئەو بیرانەی دەیانووت زەوی خڕە، یان دەیانووت باران لە هەڵمەوە دروست دەبێت، باوکم دەیووت ئەم بیرانە دەبنە مایەی گومانکردن لە بوونی خوداو گومانکردن لە تواناکانی خودا. ئیدی واراهاتبوو کاتێک دەیبینی باران بەشەستە دەبارێت، تەماشای ئاسمانی دەکردو تەکبیری دەداو داخی بۆ ئەو کەسانە هەڵدەکێشا کە دەیانووت باران لە هەڵمەوەیە.

شایانی باسە ئەو کاتە کتێبێک بۆ یەکێک لە زانایانی ئایین چاپ کرا بەناونیشانی (السیف البتار علی الکفار الذین یقولون المطر من البخار)، واتە: "شمشێری تیژ بۆ سەر ئەو کافرانەی دەڵێن باران لە هەڵمەوەیە". رۆژێکیان بەچاوی خۆم بینیم پیاوێک لە یەکێکی دەداو بەوە تاوانباری دەکرد کە گوایە وتوویەتی باران لەهەڵمەوە دروست دەبێت.

گرفتی من ئەوەبوو لە گەنجیمدا بووم بە یەکێک لەو کەسە بەئەفرەنجکراوانەی (واتە: غەربزەدە، یان لاساییکردنەوەی ئەوروپا) کە باوکم رەخنەی لێدەگرتن و داخی لێیان هەبوو. بەغداش لە ئێمەوە نزیک بوو و زوو زوو سەرم لێدەدا، سوودم لەو کتێب و گۆڤارو رۆژنامانە وەردەگرت کە لەوێ دەردەچوون. لەبەشەکانی داهاتوودا سزاکانی سەر ئەو هەڵوێستانەم دەخوێننەوە.

## بەشی پێنجەم:
## میر فەیسەڵ بن حوسەین لە بەغداد

لە ڕێکەوتی ٢٩ی یۆنیۆ/حوزەیرانی ساڵی ١٩٢١دا میر فەیسەڵ بن حوسەین گەیشتە بەغدا تا ببێت بە مەلیک پاش ئەوەی میللەت هەڵیدەبژێرن. پێشوازییەکی گەورەو شایستەی لێ کرا. بۆ ڕۆژی دوایی فەیسەڵ هات بۆ کازمیە بۆ سەردانیی مەزارگە پیرۆزەکەی ئەو شارۆچکەیە، لەوێشدا پێشوازییەکی گەرمی لێکرا شایستەی بۆ کرا، هەروەها دوو ئاهەنگیان بۆ ساز کرد، یەکێکیان لەماڵی (سەیید محەمەد بن سەیید حەسەن ئەلسەدر)، ئەویتر لەماڵی (حاجی عەبدولحوسەین ئەلچەلەبی)، لەهەردوو ئاهەنگەکەدا، هەروەک عادەتی ئەو جۆرە بۆنانە، کۆمەڵێ شیعرو وتاری بەخێرهێنان پێشکەش کران.

(سەید جەعفەر عەتیفە) زۆری پێ ناخۆش بوو کە میر فەیسەڵ چووە بۆ ماڵی دووان لە پیاوماقوڵانی کازمیە، کەچی نەهاتووە بۆ ماڵی ئەمان، ئیدی چووە لای مسز بێل سکاڵاو گلەیی لەو ڕەفتارەی فەیسەڵ کردووە. مسز بێل لەیەکێک لە نامەکانیدا باسی ئەوە دەکات کە سەید جەعفەر بە بێزارییەکەوە هاتووە بۆ لای و وتوویەتی شکۆی

من لەبەرچاوی خەلکی شارۆچکەکە شکاوە، مسز بێل وەلامی داوەتەوەو پێی وتووە گوێی مەدەری برۆ بۆ لای فەیسەڵ و داوەتی بکە بۆ ماڵەوە بۆ چا خواردنەوە، منیش مەندوبی سامی و سەرکردەی گشتیی سوپا لەگەڵ خۆمدا دەهێنم.

سەید جەعفەر بەقسەی مسز بێلی کرد، میر فەیسەڵیش ڕەزامەندی دەربڕیبوو، بڕیاریان دابوو سەردانەکە بکەوێتە پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٦ی ئاب/ئۆگستۆسی ١٩٢١، سەید جەعفەر بۆ ئەو مەبەستە چەندین جۆر شیرنەمەنی و میوەی ڕازاندەوە، هەروەها چەندین دیاریی بەنرخی ئامادە کردبوو بۆ میر فەیسەڵ و مەندوبی سامی و سەرکردەی گشتی و مسز بێل بێگومان. دەڵێن لەو بۆنەیەدا سەید جەعفەر شەست هەزار ڕوپیەی خەرج کردبوو، ئەم بڕە پارەیەش بۆ ئەو کاتە ئێجگار زۆر بوو. وەک دەڵێن کاتێک میر فەیسەڵ دەگاتە بەردەرگای ماڵەکەی، سەید جەعفەر پەلاماری دەستی دەداو ماچی دەکات. مسز بێل لە نامەکانیدا وەسفی ئەو خوانە دەکات کە سەید جەعفەر ئامادەی کردبوو و دەڵی لەژیانیدا خوانی وای نەدیوە کە پڕ بێت لەم هەموو میوەو شیرینییە جۆراوجۆرە.

بەم شێوەیە شوێنی سەید جەعفەر لە نیگای دەسەڵاتداراندا زیاتر هەڵکشا. هەروەها لەتێڕوانینی خەڵکی رەشۆک و ئاساییشدا هەر بەو شێوەیە بوو، بۆیە ئیدی سەرۆکایەتیی شارەوانی پاوانکرابوو بۆ ئەو، کەس نەیدەتوانی کێبرکێی بکات، ئەمەش هەموو ئەو خواستە بوو کە سەید جەعفەر هەوڵی بۆ دەدا. ئامانجی یەکەم و کۆتایی ئەو لە ژیاندا ئەوەبوو کە لەسەردەمی فەیسەڵیشدا هەر بە سەرۆکی شارەوانی بمێنێتەوە، هەروەک چۆن لەسەردەمی عوسمانیشدا سەرۆکی شارەوانی بوو. لەمەشدا سەرکەوتوو بوو.

## رۆژەکانی یەکەم

لە عێراقدا راپرسییەک کرا بۆ هەڵبژاردنی میر فەیسەڵ وەک مەلیکی ئەو وڵاتە، ئەنجامی راپرسییەکەش بریتی بوو لە رەزامەندیی زۆرینەی خەڵک بۆ ئەوەی میر فەیسەڵ ببێت بە مەلیکی عێراق، ئەمەش شتێکی چاوەڕوان کراو بوو، لەراستیدا زۆربەی عێراقییەکان فەیسەڵیان خۆشدەویست، خاوەن کەسایەتییەکی خۆشەویست بوو لەلایان، چونکە بەگوێرەی ئارەزوو و خواستی ئەوان قسەی لەگەڵدا دەکردن.

بڕیار درا ڕۆژی ۲۳ی ئابی ۱۹۲۱ تاج لەسەر مەلیک فەیسەڵ دابنرێت. وەک زانراوە مەلیک خۆی ئەو ڕۆژەی دیاری کردبوو بۆ تاج خستنە سەری، چونکە ڕێکەوتی ۱۸ی زولحیججە بوو بەپێی ڕۆژمێری هیجری، شیعەکان ئەو ڕۆژە بە جەژنی خۆیان دەزانن کە پێی دەڵێن (جەژنی غەدیر)، لەوباوەڕەدان پێغەمبەر لەو ڕۆژەدا عەلیی هەڵبژاردووە تا لەپاش خۆیدا ببێت بە خەلیفە، فەیسەڵیش بەهەڵبژاردنی ئەو ڕۆژە بۆ تاج لەسەرنان، ویستوویەتی ئەوە بیری خەڵکی بخاتەوە کە ئەویش لە نەژادی ئیمام عەلییە، ئەویش لایەنگری عەلییەو خۆشی دەوێ و لەسەر ڕێگەی ئەو دەڕوات.

پاش تێپەڕبوونی دوانزە ڕۆژ بەسەر تاج لەسەرنان مەلیک فەیسەڵ، مانگی موحەڕەم هات، ئەو مانگەی شیعەکان تیایدا یادی کوشتنی حوسەینی کوڕی عەلی دەکەنەوە، ئیدی پرسەی بۆ دادەنێن و بەزنجیر لەخۆیان دەدەن، مەلیک ئیعازی دابوو برە پارەیەک بۆ یارمەتیی ئەو یادە سەرف بکرێت، هەروەکو ئیعازی ئەوەیشی دابوو کە لە سەحنی کازمیەدا پرسەیەک بەناوی ئەوەوە دابنرێت، پاشان مەلیک خۆی لەو پرسەیەدا ئامادە

بوو و لەنێوان ئامادەبووان و لەتەک زانایانی ئایینی دانیشتبوو.

لەرۆژی عاشـــورا واتە لە دەی مـــوحەڕەم، ئەو رۆژەی هەر لە بەیـانی زووەوە خەڵکێکی زۆر روو دەکەنە سەحنی کازمیە، کوشتنەکە نمایش دەکەن و پرســەو مــاتەمینی و ســرووتی تــایبەتی دەگێـڕن، مەلیـک خـۆی و پیاوەکـانی ئامـادە بـوون، لەوانە (سـاطع الحصـري) کە لە بیرەوەرییەکانیدا ئامـاژەی بەو رۆژە داوە.

شوێنێکی تایبەتی بۆ مەلیک ئامادە کرا، شوێنەکە کەوتبـووە ژێـر گۆڕەپـانەکە لەسـەرووی دەرگـای قیبلە، لەوێ لەگەڵ دەست و پێوەندەکانی دانیشت، سرووتی پرسـەکەیش بەبەردەمـی ئەودا تێدەپەڕی، ئیعازی دا دیاری بۆ ئەو کەسانە تەرخان بکرێت کە دەگـرین و لەخۆیـان دەدەن ونمایشـی کوشـتنەکە دەنـوێنن، مـن ئەو رۆژە لەگەڵ باوکمدا لەیەکێک لە هەیوانەکـانی سـەحندا دانیشـتبووم، هەیوانەکـان پڕ بوون لە خەڵک و تەماشـای نوانـدنی سرووتەکەیان دەکرد، گوێم لێبوو خەلکی باسی ئەوەیان دەکرد کە مەلیکـیش لە مەقسـورەکەدا لەســـەرووی دەرگــای قیبلەوە ئامـادەیە، هەروەهـا باسـی ئاڵای عێراقیـان دەکـرد کە بـۆ یەکەمجـار لە مەوکیبی حوسـەینیەدا هەڵکرابوو. ئەو کاتە ئەوئاڵایە لەلای خەڵکی شتێکی

نامۆ بوو، هەندێ کەسیش ناڕەزاییان دەردەبڕی کە لەو بۆنە ئاینییەدا ئاڵای عێراقی هەڵکراوە، بەوپێیەی ئەمە هەمان ئەو ئاڵایەیە کە شەریف حوسەین بەرزی کردبووەوە لەکاتی هاوپەیمانییدا لەگەڵ کافرەکان و لە دژی دەوڵەتی عوسمانیی موسڵمان.

ساتع ئەلحسەری لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێ کاتێک لەسەحنی کازمیەدا نمایشی کوشتنەکە دەکرا، ئاڵای عێراقی لەتەنیشت نوێنەری سەرکردەی سوپا هەڵکرابوو کە دژی حوسەین بوو. ئەمە سەرنجی ئەلحوسەری راکێشاو بینی کە نەفرەتی خەڵکی بەتایبەتی نەفرەتی ژنان روو لە سەرکردەی ئەو سوپایە بوو کە دژی حوسەین جەنگاوە، ئەمە مانای وایە ئاڵای عێراقی یاوەریی ئەو نەفرەتلێکراوەی کردووە کە دەبوایە یاوەریی حوسەینی بکردایە.

لەو کاتەدا ئەلحوسەیری بیری لەومەترسییانە کردەوە کە دەشێت بەهۆی ئەمەوە روو بدات، ئیدی داوای لە یەکێک لە پاسەوانەکان کرد دابەزێتە گۆرەپانەکەو ئاڵاکە بگوازێتەوەو لەو شوێنە نەفرەتلێکراوە لایبات بۆ شوێنێک کە لەلای خەڵکی خۆشەویستە، پاسەوانەکە دابەزی و داوای لە هەڵگری ئاڵاکە کرد کە ئاڵاکە بباتە لای نوێنەری حوسەین، کەچی نوێنەرەکە بەتوندی پاڵی پێوە

دەنـــا، هەرچەنـــد هەوڵـــدەدرا ئـــاڵاکە لە نـــوێنەری حوسـەین نزیـک بخـرێتەوە، ئەو پترو توندتر پاڵی پێوە دەناو دووری دەخستەوەو نیشانەی تووڕەیی بە روخساریدا دیار بوو، پاسـەوانەکە ناچار هاتە لای ئەلحوسەیری وپێی وت چار چییە؟ چی بکەین؟ ئەویش وەڵامی دایەوەو وتی: "ئێستا باشترین ڕێگە ئەوەیە کە هەڵگری ئاڵاکە بەبێدەنگی لە مەیدانەکە بکشێتەوە بێئەوەی سەرنجی خەڵکی رابکێشێت..."، پاسەوانەکە دابەزی و داوای لە هەڵگری ئاڵاکە کرد بەهێمنی و بێدەنگی لە سەحنەکە بکشێتەوە، ئەویش چووە دەرەوەو نەیدەزانی بۆچی؟

**بێهیوایی**

مەلیـک فەیسـەڵ هەوڵێکـی زۆری دا سـۆزی خەڵکـی بەلای خۆیـدا رابکێشـێت و بەسـەریان بکاتەوە.

لەسـەرەتادا لەم کۆششـەیدا سـەرکەوتوو بوو، بەڵام ئەم سەرکەوتنە زۆر درێژەی نەکێشا، چونکە لێرەدا کۆمەڵێ فاکتەری دەروونی و کۆمەڵایەتی هەبوون وایان لە خەڵکی کردبوو وردە وردە لێی بێزار بن. خەڵکی نەیاندەزانی مەلیک دوچاری چ دژایەتییەک بووە لەنێوان داواکاریی ئینگلیزو داواکاریی میللەت. ئەو بەهەموو شێوەیەک

تیدەکۆشــا گونجانێــک لەنێــوان داواکــارییە دژ بە یەکەکانی ئەو دوو لایەنەدا بخولقێنێت، بەلام خەڵکی لەمە تێنەدەگەیشــتن، ئەوان دەیانویســت مەلیــک بەتەواوی و بەبــێ دوودڵــی لەگەڵ ئەمــان بێــت، چونکە ئەمان یارمەتییان داوە بێت بۆ عێراق و هەر ئەمانیش وەک مەلیک هەڵیانبژاردووە.

لەوکاتەدا هاوکێشەیەکی حیسابی بەسەر زەینی خەڵکیدا بالادەســت بــوو، بەدرێژایــی ســەردەمی پاشایەتی ئەم هاوکێشە حیسابییە کاری تێدەکردن، ئەوان پێیــان وابــوو هەرکەسێک لایەنگری ئینگلیــز بێت و کاریان لەگەڵدا بکات ناپاکە، هەر کەسێکیش دوژمنایەتییــان بکــات نیشــتیمانپەروەرە. ئەم هاوکێشــەیە بەجۆرێــک کــاری کردبــووە ســەر بیرکردنەوەی خەڵک کە لەدنیــای سیاســەتدا هێڵــی ناوەڕاســتیان لەنێــوان ناپــاک ونیشــتیمانپەروەردا نەدەناسی.

بەلام مەلیــک فەیســەڵ و دەوروبەرەکەی بە چەمکێکی تر لە سیاســەت تێگەیشــتبوون، ئەوان وا لە سیاســەت گەیشــتبوون کە بــریتییە لە هــونەری بەدیهێنــانی مــومکین. ئینگلیــز بەهێــزی ســەربازی دەســەلاتیان بەســەر ولاتــدا هەیە، فەیســەڵ و دەستوپێوەندەکەیشــی خــاوەنی هێزێکــی وا نــین بتوانن وەک نەیار رووبەڕووی ئینگلیز ببنەوە، بۆیە

فەیسەڵ لە سیاسەتکردنیدا هەردوو لای رازی دەکردو هاوسەنگیی لەنێوانیاندا دروست دەکرد. ئەمەش بێگومان سیاسەتێکی زۆر زەحمەت و قورسەو پێویستیی بە لێزانی و فێڵزانی هەیە، بەهۆی ئەمەشەوە فەیسەڵ دوچاری گرفت و خەمێکی زۆر بوو، ئەمەش، وەک دەزانرێت، گرنگترین هۆکار بوو کە لەتەمەنێکی زوودا بمرێت.

گوێم لە خەڵکی دەبوو لە دانیشتن و کۆبوونەوەو چایخانەکاندا باسی بێهیوایی خۆیان لە مەلیک فەیسەڵ دەکرد. جێی سەرنجە کاتێک بەم دواییە تەماشای ئەو دۆکیومێنتە بەریتانییانەم کرد کە تایبەت بوون بەو قۆناغە، بۆم دەرکەوت ئینگلیزیش باسی بێهیوایی خۆیان لە مەلیک فەیسەڵ دەکرد، ئینگلیزەکان لەو باوەڕەدابوون ئەمیش وەک مەلیکەکانی تر پشتگیرییان دەکات و لەتەک کاروانی ئەواندا رێدەکات، بەڵام بەپێچەوانەی چاوەڕوانییەکانی ئەوان بوو.

خەڵکی لە سروشتی ئەو بەربەست و ئاستەنگانە تێنەدەگەیشتن کە دوچاری مەلیک فەیسەڵ ببوو. هەموو کەسێک ببوو بە رەخنەگری سیاسی عەیار بیست و چوارو باوەڕیان وابوو کە خاوەنی راوبۆچوونێکی راستن، هەر کەسێک بیری لەوە دەکردەوە کە ئەگەر فەیسەڵ بەپێی ئەو

راوبۆچـوونە حـوکمی بکـردایە ئەوا سـەرکەوتوو دەبوو، ئیدی ئەم ویناکردنە لەنێو خەڵکیدا باو بوو و هەموو کەسێک ببوو بە سیاسی، کاتێک لەبازاڕدا بـۆ کڕینـی شـتێک دەچوویـت هەر ئەوەنـدە زارت هەڵبهێنـایە تـا شـتێک بڵێیت، دەمودەسـت دەبـوو بە گفتوگۆی سیاسی، ئیدی یەکێکتان یان هەردووکتـان دەبـوون بە رەخنەگـری سیاسـی و زۆر لە مەلیـک فەیسـەڵ و دەوروبەرەکەی باشـتر لە دنیـا تێدەگەیشتن.

## گەشەکردنێکی لەرادەبەدەر

دەشـی بڵێین (رای گشـتیی سیاسـی) لە عیراقدا لەسـەردەمی عوسـمانیدا زۆر لاواز بـوو، بگـرە بوونیشـی نەبـوو، کەچـی لەسـەردەمی مەلیـک فەیسـەڵدا زۆر بەخێرایـی گەشـەی کـرد. خەڵکـی لەسـەردەمی عوسمانیدا پێیـان وابـوو سیاسـەت و کاروبارەکـانی حکـومەت، کـۆمەڵە مەسـەلەیەکن پەیوەنـدییان بەوانەوە نییە، یـان نەدەبـوایە باسـی سیاسـەت بکرێت، چونکە سیاسـەت، وەک ئەوسـا دەیانووت: نان پەیدا ناکات، ئەمە جگە لەوەی دەشیا رووبەڕووی زینـدانی بکردنـایەتەوە یـان پـارەو ماڵیـان تیـا بچـوایە، خـۆ ئەگەر یەکێـک جـورئەتی بکـردایەو باسـی سیاسـەتی بکردایە، پێیـان دەووت:

ئەم حیکایەتە سوودی بۆمان نییە، باسی شتێک بکە نان پەیدا بکات.

لەسەردەمی عوسمانیدا دوو قسە یان دوو دەستەواژە هەبوون لەنێو خەڵکیدا باو بوون، ئەوانیش (من هەقم چییە بەسەرەوە) و (پەیوەندیی بە منەوە نییە)، مەبەستیان ئەوە بوو هەقیان بەسەر سیاسەتەوە نییەو ناچنە ناوی. بەڵام ئەم دوو دەستەواژەیە لەسەردەمی پاشایەتیدا کەمتر بەکاردەهێنران، بگرە هەر کەسێک بۆ خۆی ببوو بەرەخنەگرێکی سیاسی. نابێ ئەوەمان لەیاد بچێ کە ئەم گەشەکردنە لەرادەبەدەرەی رای گشتیی سیاسی، لایەنێکی نێگەتیڤیشی هەبوو، ئەمە جیاوازە لە رای گشتیی وڵاتانی دیموکراتی و پێشکەوتوو. رای گشتی لە وڵاتانی پێشکەوتوودا زەمەنێکی زۆری لە گەشەکردن و پەرەسەندندا بەسەر بردووە بەجۆرێک خەڵکی هەر لە منداڵییەوە لەسەری راهاتوون، هەروەها بەجۆرێک باسی سیاسەت دەکەن وەک ئەوەی باسی هەر مەسەلەیەکی تری ئاسایی بکەن بێئەوەی هەست بە ترس بکەن لە حکومەت.

بەڵام لە عێراقدا خەڵکی دەربارەی سیاسەت نادوێن تەنها ئەو کاتە نەبێ کە دڵنیان دوورن لە مەترسی. هەر ئەوەندەی بزانن حکومەت شمشێری

لێ بەرز کردوونەتەوە ئەوا دەمودەست دەگەڕێنەوە بۆ بیرۆکە کۆنەکەیان کە دەڵێ : (من هەقم چییە بەسەرەوە) و (پەیوەندیی بە منەوە نییە).
من لەسەردەمی مێرمنالی و گەنجیمدا زیاد لەجارێک ئەم حالەتەم لە خەلکیدا تێبینی کردووە، زۆر جار دەمبینی هەندێ لە خەلکی ماوەیەک زۆر بەپەرۆش و جۆشوخرۆشەوە باسی سیاسەتیان دەکردو کەچی ماوەیەکی تر خامۆش دەبوون، یەکێک لە نووسەرەکان ئەو کەسانەی بە (ئاگری ئاهەنگەکان) چواندووە، ئەو ئاگرەی بەخێرایی دەگەشێتەوەو بەخێراییش خامۆش دەبێت.

## بەشی شەشەم:
## لەنێوان دوو ناحەزدا

لە کازمیە لەرۆژگاری پاش جەنگی یەکەمی جیهانیدا، دوو زانای ئایینی هەبوون کێبەرکێ و بەربەرەکانێیان بوو لەسەر شوێنی بڵندی ئایینی، ئەو دوو زانا ئاینییە بریتی بوون لە (سەید حەسەن ئەلصەدر) و (شێخ مەهدی خالصی)، خەڵکی شارۆچکەکەش، بەپێی لایەنگرییان بۆ ئەو دوو زانا ئاینییە، دابەش ببوون بەسەر دوو توێژی ناکۆک، هەر توێژێک پێی وابوو بیرو دنیاکەی خۆی راستترە.

ئەم بەربەرەکانێیە زۆر بەروونی لە ئێوارەی رۆژی ١٦ی حوزەیران/یۆنیۆی ساڵی ١٩١٩دا دەرکەوت کە دەکاتە ڕێکەوتی ٢٩ی رەمەزانی ١٣٣٨ی کۆچی، لەو ئێوارەیەدا چەند شایەتحاڵێک لە بەغداوە هاتن بۆ لای شێخ مەهدی خالصی و پێیان راگەیاند کە بەچاوی خۆیان مانگیان بینیوە، ئەویش رایگەیاند سبەینێ دەکرێت بە جەژن. بەڵام سەید حەسەن ئەلصەدر بینینی مانگی لەلادا نەسەلمێنرابوو بۆیە بریاری دابوو سبەینێش هەر رۆژوو بگرن. ئیدی دوو پیاو، هەر یەکەیان لە بەرەیەک، سەرکەوتنە سەر دوو منارە لە منارەکانی

مەرقەدی پیرۆز، یەکێکیان مژدەی ئەوەی بە خەڵکی دەدا کە سبەینێ جەژنە، ئەویدی بانگی دەداو دەیووت سبەینێش هەر رەمەزانەو رۆژوو بگرن، ئیدی لەهەموو لایەکی شارۆچکەکەدا مشتومڕو گفتوگۆ هەڵگیرسا، هەر یەکێک لەو دوو تیپە پێی وابوو راستی لەلای ئەوانە.

بەربەرەکانێی ئەم دوو زانا ئاینییە زۆر درێژەی نەکێشا، هەندێ شت رووی دا بووە مایەی ئەوەی لاسەنگی شێخ مەهدی خالصی قورستر بێت لەلاسەنگی سەید حەسەن ئەلصەدر، یەکێک لەو رووداوانە سەردانیکردنی مسز بێڵی سکرتێری مەندوبی سامی بوو بۆ لای سەید حەسەن لەماڵی کوڕەکەی (سەید محەمەد) لە رێکەوتی ١٣ی مارس/ئاداری ساڵی ١٩٢٠.

مسز بێڵ لەنامەکانیدا باسی ئەوەی کردووە کە سەردانییەکەی بۆ سەید حەسەن ئەلصەدر تەنها سەردانیی موجامەلەکردن بوو، تەنها قسەوباسی گشتی لەنێوانیاندا کراوە کە هیچ پەیوەندییەکیان بە سیاسەتەوە نەبوو. لەوە دەچێ مەبەستی سەردانیکردنەکەی مسز بێڵ بریتی بووبێ لە هەوڵی پتەوکردنی پەیوەندیی فەرمانڕەوایانی ئینگلیز بە میللەتەوە، نەیدەزانی ئەم سەردانییە دەبێتە مایەی زیان گەیاندنێکی گەورە بە سەید حەسەن

ئەلصەدرو بە پلەوپایە ئاینییەکەی. خەڵکی هەر ئەوەندەی هەواڵی سەردانییەکەیان بیست، یەکسەر دەستیان کرد بەقسەو قسەڵۆکی زیادەڕۆیانە لەسەر سەید حەسەن، لەنێو خەڵکیدا پروپاگەندەیەکی وا بڵاو بووەوە کە گوایە سەید حەسەن پارەیەکی زۆری لە ئینگلیز وەرگرتووە.

لەساڵی ١٩٢٢دا شتێکی تر رووی دا، بووە هۆی دابەزینی شوێنگەی سەید حەسەن و بەرزبوونەوەی شوێنگەی شێخ مەهدی. شێخ مەهدی هەڵوێستێکی ئۆپۆزیسیۆنانەی توندی لەدژی حکومەت بەشێوەیەکی گشتی وەرگرت، و لەدژی مەلیک فەیسەڵیش بەشێوەیەکی تایبەتی. کەچی سەید حەسەن هەڵوێستی بێدەنگی و بێلایەنیی لەئاستی هەردوو لایەندا وەرگرت.

لەو کاتەدا ئۆپۆزیسیۆنبوون و نارەزایی سیاسی لەنیگای خەڵکیدا نیشانەیەک بوو لە نیشانەکانی نیشتیمانپەروەری.. ئەمە وای کرد لایەنگرانی سەید حەسەن وردە وردە کەم ببنەوە، لەبەرامبەریدا لایەنگرانی شێخ مەهدی خالصی زیادی کرد.

لەکۆتایی ساڵی ١٩٢٢دا، حکومەت فەرمانی دەرکرد بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی دامەزراندن، لێرەدا شێخ مەهدی خالصی فەتوای دا بۆ بایکۆتی هەڵبژاردن، بەو پێیەی بەشداریکردن

لەو هەڵبــژاردنەدا هاوکــارییە بــۆ ئینگلیــزی کــافر. ژمــارەیەک لە پیــاوان و لایەنگرانــی شــێخ مەهــدی ســەرلەبەیانی زوو هــاتنە دەرێ بەرەو دەرگاکــانی ســەحنی پیــرۆز تــا بڵاوکراوەکانیــانی بەســەردا هەڵبواســــن کە داوای دەکــــرد نەچــن بــــۆ هەڵبژاردنەکان.

شێخ مەهدی هەر بەوەندە وازی نەهێنا، بەڵکو لەنێو خەڵکیدا رایگەیاند کە دەبێ مەلیک فەیسەڵ لاببرێ چونکە هاوکــاری ئینگلیــزە. لە قوتابخــانە ئاینییەکەیدا وتەیەکی بۆ خەڵکێکی زۆر پێشکەش کــردو تیایــدا وتــی: (ئــیمە فەیســەڵمان هەڵبــژارد "موبایەعەمان کرد" تا ببێت بە مەلیکی عێراق بەڵام بەچەند مەرجێک، ئەویش مەرجەکانی پێشێل کرد، ئیدی هیچ بەیعەیەکی لەگەردنی ئێمەو گەردنی گەلی عێراقدا نییە).

من لەبەینی دوو بەرداشا بووم، لەلایەک باوکم، کە یەکێک بوو لەو خەڵکە کەمانەی هەر بەلایەنگری سەید حەسەن ئەلصدر مانەوە، لەبایەکی تر خزم و دراوســـی و زۆربەی خەڵکــی شــارۆچکەکەمان لایەنگری خالصی بوون. لەبـاوکمەوە هەندێ قسەم دەبیست پێچەوانەو دژی قسەی خەڵکانی دی بوون، ئەمە یەکێکــی تــر بــوو لەو فــاکتەرانەی لەقـوڵایی ناخمدا ململانێی زیندوو دەکردەوە.

## دوورخستنەوەی خالصی

پاش نیوەڕۆی رۆژی ٢١ی حوزەیران (یۆنیۆ)ی ساڵی ١٩٢٣، گەنجێک لە بنەماڵەی خالصی کە ناوی شێخ عەلی تەقی بوو، هاتە لای یەکێک لە دەرگاکانی سەحن و ویستی بلاوکراوەی پێوە بلکێنێت، دوو کەس لەو سواڵکەرانەی لەبەر دەرگای سەحنەکە دانیشتبوون کە لەراستیدا سەر بە پۆلیسی نهێنی بوون، بینییان شێخ عەلی تەقی خەریکە بڵاوکراوەیەک بە دەرگاکەدا هەڵدەواسێت، هەستانە سەرپێ تا دەستبەسەری بکەن، پۆلیسێکی ئاشکراش لەوێدا وەستابوو یارمەتیی دان، ئیدی بردیان بۆ بنکەی پۆلیس. پاش ماوەیەکی کورت، یەکێک لە کوڕەکانی شێخ مەهدی خالصی کە ناوی شێخ حەسەن بوو، هاتە لای دەرگای سەحنەکە تا بڵاوکراوەیەکی دیکەی پێوە بنووسێنێت، پۆلیسێک لەوێدا وەستابوو پەلاماری شێخ حەسەنی داو ویستی دەستی بەسەردا بگرێت، بەلام شێخ حەسەن زوو هاواری بەسەر خەڵکەکەدا کردو پێی وتن: (ئەم پیاوە بکوژن، ئەمە کافرێکی جولەکەیە)، خەڵکیش بەربوونە لێدانی و کەوتە سەر زەوی، شێخ حەسەن چەقۆیەکی لەگیرفانیدا دەرهێناو بە پۆلیسەکەی وت هەر دەتکوژم، بەلام پۆلیسەکە توانی هەڵبێت، بەپێی پەتی و بەرەنگی

هەڵبزرکــاوەوە چــووە بــنکەی پــۆلیس، لەلای سـەرۆکەکەی (عبدالرزاق فەزلـی) سـکالای کرد لەو حاڵەی بەسەریدا هاتووە.

عەبـدولرەزاق فەزلـی لەگەڵ چەنـد پۆلیسـێکدا بەپەلە چـوونە سـەحنەکە بەڵام کەسـیان نەبینـی، پاشـان رۆیشـتنە مـاڵی شـێخ حەسـەن و بەدوایـدا دەگەران، لەوێدا دەستیان بەسـەردا گرت، هەروەها دەستیان بەسـەر شێخ عەلیی برای و شێخ سـەلمان قەتیفیشدا گرت کە سکرتێری شێخ مەهدی خالصی بوو.

حکـومەت سـەبری نەمـا بەرامـبەر خالصـی، بریاریـان دا لە عیـراق دووری بـخەنەوە، لە ٢٥ی حـوزەیران (یۆنیـۆ)ی هەمـان سـاڵدا حکـومەت بەیانـنامەیەکی توندی دەرکرد تیایدا هەرەشـەی لە پیاوانی ئایین کرد و بەشێوەیەکی ناشیرین زەمی کردن، پیاوانی ئایینی بەوە وەسف کرد کە ئەمانە فرتوفێڵ دەکەن و هیچ پەیوەندیەکیان بە مەسـەلەی عەرەبییەوە نییە، ئەمانە قسـەی وا ئەخوڵقێنن گوایە لە شـەریعەتی ئـاینییەوە دەرهێنـراوە، کەچـی مەبەستێکیان نییە تەنها ئەوە نەبێ هەڵبژاردنەکان بشـێوێنن و رای گشـتی بەلارێـدا بەرن و رێگـری دروسـت بـکەن لە گەیشـتنی گەڵ بە دەسـەڵات.

هەروەها لە بەیاننامەکەدا هاتووە: سەبرو نەرمیی حکومەت ئەو کەسە غەریبانەی هان دا بەردەوام بن لە فریودانی خەڵکی و تەنانەت بەم دواییە سنووری مەزارگە پیرۆزەکانیشیان بەزاندو کۆمەڵی کردەوەی پێچەوانەی نەریتی ئایینییان نواندووە کە خەڵکی ئیماندارو ئایینپەروەر ئەم شتانە قبوڵ ناکەن، ئەو کەسانە بەناوی ئایینەوە بڵاوکراوەی خراپیان لەسەر مەزارگەی ئیمامەکان و دەرگای سەحندا بڵاوکردۆتەوەو شوێنە پیرۆزەکانیان ئەتک کردووەو حورمەتیان شکاندووە، ئەم کردەوانەیان تەنها بۆ ئەوە کردووە تا زیان بە میللەت بگەیەنن. لەکۆتایی بەیاننامەکەشدا هاتووە: بەم بۆنەیەوە دەبێ ئەوە بزانرێت هەرگیز حکومەت بەرامبەر بەو کردەوانە بێدەنگ نابێت و سزای هەموو ئەو کەسانە دەدات کە یاری بە مافە رەواکانی میللەت دەکەن.

لە ئێوارەیەکی درەنگی ٢٦ی حوزەیران (یۆنیۆ)دا، عەبدولرەزاق فەزڵیی بەڕێوەبەری پۆلیس لەگەڵ موختاری گەڕەکی شیوخ و مفەوەزێک و پێنج پۆلیسدا هاتنە ماڵەکەی خالصی، بە هێمنی خالصیان دەستبەسەر کردو بە ئۆتۆمبێلێک بردیانە وێستگەی شەمەنەفەر لە بەغدا، ئۆتۆمبێلێکی تریش

لەدوایانەوە دەڕۆیشت کە مفەوەزەکەو پێنج پۆلیسەکەی تیا بون.

کاتێک ئەمان گەیشتنە ویستگەی شەمەنەفەر، دنیا بەتەواوی تاریکی کردبوو، هێزێکی گەورەی سوپاو پۆلیس بەو ناوەدا بڵاو ببوونەوە، هەروەها شەمەنەفەرێکی تایبەتیان ئامادە کردبوو کە بریتی بوو لە سێ فارگۆن، یەکێکیان کە لە پلەیەکی باشدا بوو تەرخان کرابوو بۆ خالصی، دوو فارگۆنەکەی تر بۆ گواستنەوەی ئەو هێزە بوو کە ڕاسپێردرابوون پارێزگاری لە شەمەنەفەرەکە بکەن و لەڕێگادا پاسەوانیی بکەن. خالصیان لەپێشەوە داناو ئینجا چوار کەسەکەی تریشیان سەرخست و لەتەنیشتی خالصی دایان نان، ئەو چوار کەسەی کە بەر لە خالصی دەستبەسەر کرابوون، بریتی بوون لە: هەردوو کوڕەکەی: شێخ حەسەن و شێخ عەلی و هەروەها شێخ عەلی تەقی و شێخ سەلمان قەتیفی، شەمەنەفەرەکە بەرەو بەسرەی بردن، لەوێشەوە بە پاپۆڕێک بردنیان بۆ حیجاز.

بۆ سەرلەبەیانیی ڕۆژی دوایی، کاتێک هەواڵەکە لە کازمیە بڵاو بووەوە، پشێوی و غەڵبە غەڵب پەیدا بوو و خەڵکی دوکانەکانیان داخست و لە سەحندا کۆبوونەوەو زۆر تووڕەو نائاسایی بوون، بەڵام

عەبـدولرەزاق فەزلـی لەمـاوەیەکی کورتـدا تـوانی کۆنترۆڵی بارودۆخەکە بکات، چەند پۆلیسێکی ناردە نێو بازاڕەکە تا ژمارەی ئەو دوکانانە تۆمار بکەن کە داخرابوون، چەند کەسێکیشی نارد تا بانگەشەی ئەوە بکەن هەر کەسێک بەردەوام بێت لە داخستنی دوکانەکەی، ئەوا سزایەکی توند دەدرێت. ئەوەبوو خەڵکەکە گەڕانەوە سەر نەریتە کۆنەکەی خۆیان و خێـــرا دوکانەکانیـــان کـــردەوەو تەماشـــای ئەملاوئەولایـان دەکرد نەوەک کەسـێک بیانبینێت، دەیانویست بڵێن (من هەقم چییە) و (پەیوەندیی بە منەوە نییە).

حکـومەت بەیاننـامەیەکی بـۆ مـیللەت دەرکـرد، تیایدا هاتووە: بەڵگەی حاشاهەڵنەگر لەبەردەستدان کە شـێخ مەهـدی و هەردوو کـوڕەکەی و شـێخ سـەلمان قەتیفی و شێخ عەلی تەقی، ئەمان بوونە مایەی ئەو دۆخەی لە بەیاننامەکەی پێشوودا باس کراوە، بۆیە لەوڵات دەرکران. حکومەت جارێکی تر رایدەگەیەنێت کە نیازی وایە دەسەڵاتی قانونی بداتە دەست نوێنەرانی راستەقینەی گەل، لەو کەسانەش خـۆش نابێـت کە لەژێـر پەردەی ئـایینەوە بەپێـی ئارەزووەکانی بێگانان یارییان بەو مەسـەلانە دەکرد کە پەیوەستن بە مافەکانی نەتەوەوە.

## مردنی خالصی

پاش ئەوەی خالصی فەریزەی حەجی بەجێ هێنا، چوو بۆ ئێران و لەناوچەی خوراسان نیشتەجێ بوو. سکرتێرەکەی کە ناوی (الشیخ سلمان القطیفی) بوو، لێی جیابووەوەو گەڕایەوە بۆ عێراق، دواتر بەناوی (سلمان الصفوانی) لە ڕاگەیاندندا کاری دەکرد .

لە ئێوارەی ٧ی نیسان/ئاپریلی ساڵی ١٩٢٥دا، لە خوراسانەوە بروسکەیەک گەیشتە کازمیە، ناوەڕۆکی بروسکەکە بریتی بوو لە هەواڵی مەرگی خالصی، شارۆچکەکە بەم هەواڵە ورووژا، خەڵکێکی زۆر دەستیان کرد بە گریان، بۆ ڕۆژی دوایی بازارەکان داخران وەک ڕاگەیاندنی ماتەمینی، چەندین کۆڕەو لەشێوەی کۆڕەوی حوسەینیە دەستی پێکرد، کۆڕەوەکان خەمبار بوون و لەسنگی خۆیان دەدا ڕێک وەک یادی حوسەین، حکومەت وەک لێخۆشبونێک چاوپۆشیی لەو کارە کردو گوێی نەدانێ، بەڵام ڕۆژ لەدوای ڕۆژ خەم و ماتەمینی زیادی دەکرد.

ئەوەی جێی سەرنجە، خەڵکی ئەعزەمیە، ئەو شارۆچکەیەی دەکەوێتە باشوری کازمیە لای دیجلەوە، کۆڕەوێکی تایبەتییان نارد تا لەگەڵ

خەلکی کازمیەدا هاوخەمی بنوێنن و بیسەلمێنن کە کۆچکردوو لەراستیدا کۆچکردووی هەموو موسڵمانانەو هیچ جیاوازییەک لەنێوان شیعەو سوننەدا نییە، ئیدی دەستیان بەو ئەهزوجەیە کرد ئەهزوجە (واتە ئەو سترانە کورتەی بە ئاوازێکی تایبەتی و دووبارە وتنەوەو بە هەڵبەزینەوە دەیڵێنەوە، ئەمە لەباشوری عێراقدا باوە —و-)

یا عمود الاسلام حامي الشريعة
يتمت ها المخلوق سنه و شيعة

ئەمە رێک لەو کارە دەچێت کە دیسان خەلکی ئەعزەمیە بەر لە سێ ساڵ، لەساتەوەختی شۆڕشی بیستداو بەبۆنەی رۆژی عاشوراوە، کۆڕەوێکی تایبەتییان نارد بۆ سەحنی کازمیە، ئەهزوجەیەکی لەم جۆرەیان دەووتەوە:

جيت أشدكم  يا شيعة صدق زينب سلبوها
أي وحق جدها و أبوها حتى الخيام حرقوها

بەبۆنەی مەرگی خالصییەوە چەندین ئاهەنگی ماتەمینی لە کازمیەو بەغداو شارەکانی تریش دامەزرا، ژمارەیەک شاعیرو وتارخوێنی شیعەو سوننە پێکەوە بەشدارییان لەو ئاهەنگی ماتەمینیانەدا کرد، لەوانە شاعیران: جەمیل سدقی

زەهاوی و مەعروف رەصافی و حاجی نوعمان ئەعزەمی و عبدالحسین الازری و عبود الکرخی.

رۆژانە ئاهەنگی ماتەمینی لەکازمیەدا لە قوتابخانەی خالصی دادەمەزرا، من پەرۆشی ئامادەبوونی ئەو ئاهەنگانە بووم تا گوێ لەو شیعرو وتارانە بگرم و بزانم گوێگران چۆن وەلام دەدەنەوەو دەڵێن: (دەمخۆش، دووبارە).

یەکێک لەوشیعرانەی لەو ئاهەنگانەدا وترانەوە، شیعرێکی میللیی شاعیری میللیی ناسراو عبود کرخی بوو، ئەو شیعرە لە نامیلکەیەکی تایبەتیدا چاپ کراو لەبازاڕدا بەرادەیەکی بەرین دەفرۆشرا. یەکێک لەو دێرە شیعرەی خەڵکی لەبەر خۆیانەوە دەیانوتەوەو لەبیرم ماوە، دەڵێ:

غاندي بالهند زغلول بمصر

وانت ثالثهم الى هذا القطر

مانای ئەم دێرە شیعرە ئەوەیە خالصی سەرکردەی گەلی عێراقە وەک چۆن غاندی سەرکردەی گەلی هیند و سەعد زەغلولیش سەرکردەی میسر بوون.

یەکێک لەو شتە خۆشانەی پێویستە لێرەدا بیگێڕمەوە، مێژوونوسی ناودار جەواد عەلی لەو رۆژگارەدا قوتابی بوو لەقوتابخانەی ئیمامی

ئەعزەم لە کازمیە، کاتێ هات بۆ ماتەمینییەکەی کازمیە، تەربوشێکی سووری لەسەر نابوو وەک نەریتی (ئەفەندی)یەکانی ئەو رۆژگارە، شیعرێکی ماتەمینیی بۆ خالصی خوێندەوە کەخۆی هۆنیبوویەوە، ئامادەبووان زۆریان بەدڵ بوو، بەتایبەتی ئەو دێرە شیعرەی ئاماژە بۆ قەسیدەیەکی عبود کرخی دەکات و بەربەرەکانی دەکات و دەڵێ:

ان فاخرت مصر بسعد زعيمها
سعد يقاس بآيه الجبار؟!

ماناي ئەم دێرە شیعرە ئەوەیە کە مومکین نییە سەعد زەغلول بە خالصی بەراورد بکرێت، چونکە ئەمەی دوایی ئایەتوڵڵایە. کاتێک ئامادەبووان گوێیان لەم دێرە بوو، دەنگیان هەڵبڕی و چەندین جار وتیان (دەمخۆش، ئافەرین، دووبارە دووبارە).

وەک چۆن قەسیدەکەی عبود کرخی و جواد علی بووە مایەی رەزامەندیی ئامادەبووان، بەهەمان شێوە ئەو شیعرەی مەعروف رصافی کە لەبەغدا خوێندیەوە بووە جێگەی خۆشحاڵیی خەڵکەکە، بەتایبەتی دوو دێری تیایە کە خەڵکی بۆ ماوەیەکی درێژ باسیان دەکردو گفتوگۆیان لەسەر دەکرد، ئەو دوو دێرەی مەعروف رەسافی بەم شێوەیەیە:

رحم الله شيخنا انه كان
بعيدا عما تريد السياسة
ما تعاطى غير الخداع غلادستون
كلا و لا دلكاسه

گلادستۆن و دلكاسه كه مەعروف رەسافی له شیعرەكەیدا ناوی هێناون، دوو زانای رامیاریی زۆر ناوداری كۆتایی سەدەی نۆزدەیەمن، یەكەمیان بەریتانییەو دووەمیان فەرەنسییە. مەبەستی رەسافی لەناوهێنانی ئەو دوو كەسایەتییە ئەوەیە كه شێخ مەهدی خالصی دوور بوو له فریودان، فریودان و فرتوفێڵ كاری سیاسەت و سیاسەتمەدارانی وەك گلادستۆن و دلكاسه.

## ئاماژەیەكی كۆمەڵایەتی

شێخ مەهدی خالصی لەپاش مردنی، لەزەینی خەڵكیدا بوو به ئەفسانه، لەهەموو شوێنێكدا ناویان دەهێنا، ئەمه ئاماژەیه بۆ مۆركی ئەو جۆره له 'رای گشتی' كه لەوكاتەدا له عێراقدا باو بوو. هەر كەسێك دژی حكومەت بوایه جێگەی رێزلێنان بوو.

لەكاتێكدا ناوبانگ باشیی خالصی بڵند دەبووەوە، ناوبانگی ركابەرەكەی (سەید حەسەن ئەلصەدر) دادەبەزی، وای لێهات هەندێ كەس له خەڵكی كازمیه كه حسن الصدریان له رێگاوبانەكاندا

دەبینی، جۆرێک لە پلاری ناشیرین و رقئامێزیان تێدەگرت.

لەو کاتەشدا سەید حسن الصدر پیر ببوو و بەتەمەندا چووبوو، واراهاتبوو کە دەچووە مزگەوت بۆ نوێژکردن، بەسواری گوێدرێژ دەرۆیشت، دەمبینی هەندێ لە دوکاندارەکان قسەی ناشیرینیان پێدەووت، ئەویش بە بێدەنگی و خۆگری بەردەوام دەبوو لەسەر رۆیشتن.

ئەوەی نەهامەتیی ئەم پیاوەی زیاتر کرد، ئەوەبوو کورەکەی بەناوی سەید محەمەد، پەیوەندییەکی نزیک و زۆر باشی لەگەڵ مەلیک فەیسەڵدا هەبوو، مەلیک فەیسەڵیش کردی بە ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران (واتە پەرلەمان)، خەڵکیش پێیانوابوو ئەمە ناپاکییەکی نیشتیمانییە کورو باوک کردوویانە.

سەید محەمەدی کوڕی سەید حسن الصدر لە گەڕەکی(ئەلبەحیە)دا دەژیا کە یەکێکە لە گەڕەکە هەرە دێرینەکانی کازمیە، بۆیە ناچار دەبوو بەهەندێ ڕێگای دیدا بڕوات تا دەگاتە وێستگەی تراموای بۆ ئەوەی سواری تراموای بێت (کە ئەسپ رایدەکێشا) و بچێت بۆ ئەنجومەنی نوێنەران کە کەوتبووە بەری کەرخ. ئەوەی لەیادم مابێت

دەمبینـــی، ئەو کـــاتەی ســـەید مـــحەمەد بەرەو ترامـــوایەکە دەڕۆیشـــت، ڕۆژنامەفرۆشـــەکە دوای دەکەوت و لەدواوە هـــاواری دەکـــردو دەیـــووت: (هەواڵی سیخوڕە گەورەکە!!)، کە بێگومان مەبەستی سەید محەمەد بوو.

دواجـار سـەید مـحەمەد ناچـار بـوو لە گەڕەکی ئەلبەحـــــیە دوور بکەوێـــــتەوەو لە بەری کەرخ لەگەڕەکی جعیفەر خـانوویەک بە کرێ بگرێت کە نزیک بوو لە ئەنجومەنی نوێنەران.

## بەشی حەوتەم:
## لەنێو (مەکتەبلی)ی کوڕی (ئەفەندی)دا کەسایەتیم دروست بوو

لە بەشەکانی پێشوودا باسی هەندێ لەو رووداو و بارودۆخانەم کرد کە لەمنداڵی و مێرمنداڵیمدا پیایاندا رۆیشتووم، ئەو رووداوانەش کاریگەرییان لەسەر بیرکردنەوەو کەسایەتیمدا هەبوو. لەم بەشەدا باسی ئەو رووداوانە دەکەم کە تایبەتن بە خۆم، واتە ئەوانەی کاریگەرییەکی زیاترو راستەوخۆتریان لەسەر پێکهێنانی کەسایەتیمدا هەبوو.

لەرۆژگاری منداڵیمدا لە کازمیە چەند (کەتاتیب)ێک هەبوون بۆ فێربوونی خوێندنەوەو نووسین و بیرکاری (کەتاتیب: واتە خوێندن لە مزگەوت و لەلای مەلا، لەلای خۆمان پێیان دەوت حوجرە -وەرگێڕ)، تەنها یەک قوتابخانەی نوێ هەبوو کە لەکۆتایی سەردەمی عوسمانیدا بنیات نرابوو و کەوتبووە باشووری شارۆچکەکەوە لەتەنیشت سەرای حکومەت، خەڵکی بەو قوتابخانەیەیان دەووت (مەکتەب)، ئەو قوتابیانەش کە لەوێدا دەیانخوێند پێیان دەووتن (مەکتەبلی).

زۆربەی خەڵـک بەچـاوێکی پـڕ لە گومـانەوە تەماشـــای ئەو قوتابخانەیەیـــان دەکـــرد، ئەو تێڕوانینەیان لە سەردەمی عوسمانییەوە بۆ مابۆوە، چـونکە قوتابخـانە نوێیەکـان تـایبەت کرابـوون بـۆ کوڕانی (ئەفەندی)یەکان، واتە بۆ منالانی فەرمانبەرە حکومییەکـان، پێیـان وابـوو ئەو جـۆرە قوتابخـانەیە لادانی سێکسیی تیادا باوە، لێرەوە ئەو پەندە باوە هـاتووە کە دەڵـێ: (کتێبەکـان تـووڕ هەڵـدە، ئیشـی مەکتەب سوودت پێ ناگەیەنێت)، (ذب الكتب شغل المكتب مايفيدك) .

سیاسـەتی مەلیـک فەیسـەڵ بریتـی بـوو لە زیـادکردنی قوتابخـانەی نـوێ، هـانی خەڵکیـی دەدا منالەکانیـان بـخەنە قوتابخـانە نوێیەکـانەوە، بەڵام ژمـــارەیەکی زۆر کەم لە خەڵکـــی بەدەنـــگ ئەو بـانگەوازە رۆیشتن، زۆربەیان لەسەر بیروباوەڕی کۆنیان مانەوە.

بـاوکم لەســەرەتادا وەک زۆربەی خەڵکـی دی بەگومـانەوە تەماشـای قوتابخـانەی نـوێی دەکـرد، بۆیە خستمیە یەکێک لە کەتاتیبەکانەوە لەلای شێخ سـەعید لەمزگەوتێکی نزیکی ماڵمـان، ئیدی منـیش وەک شـێوازی کـۆنی ئەو سـەردەمەو لەلای مەلادا فێری خوێندنەوەو نووسین و بیرکاری بووم. پاش

ماوەیەک کە بیرم نەماوە چەندی پێچوو، قورئانم خەتم کرد، بەو بۆنەیەوە ئاهەنگێکی تایبەتییان بۆ ساز کردم کە پێی دەوترێت (زەففە) بەو پێیە من لەنێوان کۆمەڵی قوتابیدا دەڕۆیشتم ئەوان مۆمیان بەدەستەوە بوو و سروودی تەقلیدی و ئەهازیجیان دەووتەوە تا گەیشتینە ماڵەوە.

ڕۆژێکیان باوکم لەناکاو منی لە کەتاتیب دەرهێناو بردمی بۆ قوتابخانەو لەوێ لە وەرزی دووەمدا تۆماری کردم، بەڵام زۆری پێ نەچوو لە قوتابخانە دەریهێنام و گەڕاندمیەوە بۆ کەتاتیب بۆ لای شێخ سەعید، قسەیەکی بۆ شێخ سەعید کرد ئێستاش لە یادەوەریمدا هەڵکۆڵراوە، پێی وت: (مەکتەب سوودی نییە!).

بەڵام جارێکی تریش لە کەتاتیب دەری هێنام و لە قوتابخانە تۆماری کردم، ئەمجارە بۆ ماوەی چوار ساڵ لە قوتابخانەدا خوێندم تا گەیشتمە پۆلی پێنجەم، من لەهەموو وانەکاندا لەپێش بووم و هەموو ساڵێکیش یەکەم دەردەچووم، بەڵام ئەم سەرکەوتنانەی من لەلای باوکم نەبوو بە شەفاعەتێک کە بەردەوام بم لە خوێندن، ئەوەبوو لەناکاو جارێکی تر لە قوتابخانە دەریهێنام و بڕیاری دا لەبری دەوامی قوتابخانە، هەر لە

دوکـــانەکەی خۆیـــدا دەوام بـــکەم، ئەمە بـــۆ ئەوەی ڕاهێنـــان لەســـەر پیشـــەیەک بـــکەم کە لەگەورەییمـــدا ژیانم دابین بکات، پێی وابوو قوتابخانە بۆ بژێویی ئایندەم سوودی نابێت.

## لە دوکانەکەی باوکمدا

بۆ ماوەیەک لە دوکانەکەی باوکمدا دەوامم کرد، ئەمە یەکەم ئەزمـــوونی مـــن بـــوو بـــۆ ناســـینی کاروبـــــاری بـــــازاڕو چـــــۆنێتی بەڕێوەچـــــوونی ساتوســـەودای بـــازاڕ، ئەم ئەزمـــوونەش بێگومـــان ئەزمـــوونی دیـــکەی بەدوای خۆیـــدا هێنـــا. ئێســـتا وا هەست دەکەم ئەو ئەزموونـانە سـوودێکی زۆریـان پێگەیاندم بۆ تێگەیشتن لە سروشتی بەشەر.

بەداخەوە دەڵـــێم بـــاوکم لەمامەڵەکردنیـــدا لەگەڵ کڕیارەکانـــدا شـــارەزاو لێهـــاتوو نەبـــوو، کە ئەمە هونەرێکە پێویسـتە هەمـوو ئەو کەسـانەی لەبازاڕدا کـار دەکەن، بیـزانن، بەتـایبەتی ئەوانەی لەبـواری پیشـەی زێـڕینگەری کـار دەکەن. بـاوکم زوو تـوڕە دەبـوو، کە ڕاوبۆچـوونێکی دەردەبـڕی لای وابـوو تەنهـا بۆچـوونەکەی خـۆی ڕاسـتە، بـۆیە هەمیشـە لەگەڵ کڕیارەکانیـدا دەکەوتە نـاکۆکییەوە، ئیـدی بە تێپەڕبوونی کـات و پلە بەپلە ژمـارەی کڕیارەکـانی

کەم دەبووەوە، بەهۆی ئەمەشەوە هەم خۆی و هەم ئێمەش دوچاری دۆخێک بووین تیایدا تاڵی ونەهامەتی و بێبەشیی زۆرمان چەشت.

ئەم سیفەتەی باوکم تەنها لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ کڕیارەکانیدا قەتیس نەکرابوو، بەڵکو لەگەڵ هەموو کەسێکدا ئەو ڕەفتارەی دەنواند، ئەمەش بەخواست و هەڵبژاردنی خۆی نەبوو، چونکە کەسایەتیی باوکم، هەروەک کەسایەتیی مرۆڤەکانی دی، بریتی بوو لە دەرەنجامی کارلیکی نێوان سیفەتە بۆماوەییەکان و ئەو بارودۆخەی تیایدا گەورە ببوو (هەروەکو لەبەشەکەی پێشوودا باسم کردووە). بەڵام خەڵکی لەم شتانە تێنەدەگەیشتن، بەڵکو وایاندەزانی خۆی دەتوانێت چۆنی بوێت بەو جۆرە کەسایەتیی خۆی دروست بکات، بۆیە ئەگەر لەژیاندا شکستی بهێنایە گلەییان لێدەکردو پێیان وابوو تەنها خەتای خۆیەتی.

دوکانەکەی باوکم وەک قوتابخانەیەک وابوو بۆ من، وانەیەکی زانستیی زۆر بەنرخی تیادا فێر بووم. فێری ئەوە بووم کە هەق و ڕاستی لەلای خەڵکیدا مەسەلەیەکی ڕێژەییە، ئەوەی کەسێک پێی وایە هەقە، کەسێکی دی وایدەبینێ کە ناهەقە. لێرەوە ئەو پەندە باوە لەنێو پیشەوەرانی وڵاتانی

پیشکەوتوودا بڵاو بووەوە کە دەڵێ: "هەمیشە کڕیار لەسەر هەقە."

پیشەوەری سەرکەوتوو لەسەر بنچینەی هەق وناهەق مامەڵە لەگەڵ کڕیارەکانیدا ناکات وەک چۆن باوکم و کەسانی تری وەک ئەو دەیانکرد، بەڵکو دەبێ لەسەر ئەو بنچینەیە مامەڵە بکرێت کە هەمیشە کڕیار لەسەر هەقە. دەشێت ئەمە لە ماوەیەکی کورتدا ببێتە مایەی زیانی پیشەوەرەکە، بەڵام لەماوەدای دووردا دەبێتە مایەی قازانج. سومعەی هەمیشەیی پیشەوەر زۆر سوودبەخشترە وەک لەوەی جاروبار مشتومڕ لەگەڵ کڕیاردا بکات.

جارێکیان لەیەکێک لەپیشەوەرەکانی وڵاتی خۆمانم پرسی تا چەندە ئەو قسەیەی پراکتیک کردووە کە دەڵێ هەمیشە کڕیار لەسەر هەقە، وەڵامی دامەوەو وتی ئەگەر لەگەڵ کڕیارەکانیدا بەپێی ئەوپرەنسیپە بجولایەتەوە ئەوا دەیانخوارد. بە ڕای ئەو هەندێ لە کڕیارەکان لەوڵاتی ئێمەدا ئەو دەرفەتە دەقۆزنەوەو هەوڵ دەدەن فێڵ و تەڵەکەبازی لە پیشەوەرەکە بکەن و تاڵانی بکەن، کە دەشێت ئەمە ببێتە هۆی مایەپوچبوونی پیشەوەر.

بۆچـوونی ئەو پیشـەوەرە راسـتە بەڵام لەژێـر ڕۆشنایی ئەو نەریتانەی لەژینگە کۆمەڵایەتییەکەی خۆیدا باو بوون، لەوێدا پیشەوەرو کڕیار لەسەر ئەوە راهاتبوون کامیان دەیبەنەوە، واتە هەریەکێک لەوانە دەیویست لەکاتی مامەڵەکردن و سەودادا لەویدیکەی بباتەوە، لێرەوە ئەو جۆرە پەندانە لەنێویاندا سەری هەڵدا کە بۆنموونە دەڵێ: "هەزار قەڵبە بەبێ دۆڕان" (ألف قلبة و لا غلبة)، (واتە هەزارجار وەرگەڕێی بەڵام یەک جار بەفێڵبازی لێت نەبەنەوە-و-)یان: "هەر سەودا بکە هەتا ئارەق بەنێوچەوانتدا دێ"، (ساوم حتى يعرق جبينك).

باشترین مامەڵەکردن لەگەڵ کڕیاردا ئەوەیە کە پیشەوەر هەڵوێستێکی مامناوەندی بگرێت، لەسەرێک نابێت لەسەر بنچینەی هەق و ناهەق مامەڵە بکات، لەسەرێکی تر پێویستە ئاگاداری نەریتە باوەکانی ژینگە کۆمەڵایەتییەکەی بێت.

ئەم ڕێسایە تەنها سوودی بۆ پیشەوەرەکان نییە، بەڵکو سوودی بۆ هەموو مرۆڤێک هەیە کە بیەوێت بەهەر شێوەیەک مامەڵە لەگەڵ ئەوانیدیدا بکات، سروشتی مرۆڤ لەهەموو بوارێک لەبوارەکانی ژیاندا هەر یەک سروشتە.

## دروستکردنی عەتر

رۆژێکیان کە لە دوکانەکەی باوکمدا دەوامم دەکرد، باوکم بریاری دا واز لە دوکان بێنم و ئیشێکی تر بکەم و پیشەیەکی تر هەڵبژێرم. لەسەرەتادا نەمدەزانی چی وای لە باوکم کرد ئەو بڕیارە بدات، پاشان هۆیەکەیم بۆ دەرکەوت: سەید جەعفەر عەتیفە کە خاوەنمولکی دوکانەکەی باوکم و چەندین ریزە دوکانی تر بوو، داوای کرێی دوکانی لە باوکم دەکرد کە چەند مانگێک بوو نەیدابوو، رۆژ لەدوای رۆژ داواکەی دووبارە دەکردەوەو کرێکەش کەڵەکە ببوو، ئیدی سەید جەعفەر سکالای لەسەر باوکم تۆمار کردو بەهۆیەوە باوکم خرایە زیندانەوە، چەند رۆژێکی تیا مایەوەو دواتر سەید جەعفەر بەپیاوەتیی خۆی ئیعازی دابوو لەبەندیخانە ئازاد بکرێت.

پێدەچوو باوکم حەزی نەکردبێ ئەو ناکۆکی و ململانێیە ببینم کە لەنێوانیاندا رووی دا، بۆیە بریاری دا واز لە دوکان بهێنم و کارێکی تر بکەم. پاش ماوەیەکی کورت لەدوکانی عەتارێک یان بۆنفرۆشێک بە کرێ کارم کرد، ئەو دوکانە عەتری دروست دەکرد، ئەو دوکانە کەوتبووە گەڕەکی ئەنبارییەکان و خاوەنەکەیشی ناوی محەمەد رەزا

بوو، مانگانە تەنها پێنج روپیەم وەردەگرت، واتە تەنها سێ سەدو حەفتاو پێنج فلس.

بۆ ماوەی پتر لە دوو ساڵ لەو دوکانەدا کارم کرد، ئەو دوو ساڵە بەلای منەوە ناخۆشترین دوو ساڵم بوو پیایدا رۆیشتم، چونکە هەموو رۆژێک سەرلەبەیانی زوو لەگەڵ خۆرهەلاتن دەستم بەکار دەکرد هەتا کاتژمێر یەکی شەو، تەنها دوو کاتژمێر پشووم هەبوو، کاتژمێرێک بۆ کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ لە ماڵەوە، ئەویدیش بۆ کاتی نوێژی نیوەڕۆ و عەسر لە مزگەوتێکی نزیکی دوکانەکە. لەو رۆژگارەدا وا باو نەبوو کە دوکانداران لە رۆژی هەینیدا دوکان دابخەن و کار نەکەن، بۆیە لەهیچ رۆژێکی هەفتەدا بەتەواوی ئیسراحەتم نەدەکرد. بگرە رۆژانی هەفتە بەلای منەوە رۆژانێکی پێکەوە بەستراوی خەم و سەختی بوو.

رۆژێکیان لەکاتی عەسردا وەستاکەم بە ئەرکێک ناردمی بۆ کەناری رووبارەکە، لەوێدا چەندین چایخانەو قاوەخانەم بینی پڕ بوون لە خەلکی و گوێیان بۆ ئەو گۆرانییانە شل کردبوو کە لە ئامێرە کۆنەکەوە (گرامۆفۆن) لێدەدرا، مەبەستم ئەو گۆرانییانەی لەو کاتەدا باو بوون، وەک گۆرانییەکانی محەمەد قەبانچی و رەشید قوندەرچی

و بەدریە ئەنــــوەر. ئەم دیــــمەنە دوچـــاری سەرســـوڕمان و حەپەســـانی کـــردم و لەخـــۆمم دەپرســـی: (ئەم کەســـانە چـــۆن بژێـــویی ژیانیـــان بەدەســـت دێـــنن؟ و لەکوێـــدا دەژیـــن؟)، مـــن لەو بـاوەڕەدا بـووم بەدەستهێنانی بژێـوی پێویسـتیی بەوەیە کە دەبێ لەخۆرهەڵاتنەوە تا شـەو درەنـگ کار بکەیت.

ئەو قۆنـــاغە ئـــازاربەخش و ئەو ســـاتەوەختە ناخۆشـــە، خـــاڵی نەبـــوو لە ســـوودو مەنـــفەعەت، بەشێوەیەک لەشێوەکان سوودی هەبوو بەپێی ئەو قســـەیەی کە دەڵـــێ: "دەشـــێت شـــتی زیـــانبەخش سوودیشی هەبێت" (رُبَّ ضارة تنفع).. ئەمە وانەیەکی باشـــی لەژیانـــدا پـــێ بەخشـــیم کە نەمـــدەتوانی لەوانەکانی قوتابخانەدا، ئەگەر لەقوتابخانە بەردەوام بوومایە، فێری ببم. من لەو قۆناغەدا خەڵکیم وەک حەقیقەتـی خۆیـان ناسـی بەبێ ماسـک و رتووش. ئەو موجـامەلانەی خەڵکی لەژیـانی کۆمەڵایەتییانـدا پێی راهاتبوون، بەرامبەر بەهەمـوو تاکێک لەهەمـان ئاستدا نەبوو، موجامەلە بەرامبەر بەو کەسانە زۆر بـوو کە دەوڵەمەنـدو خاوەنمولـک بـوون، کەچـی بەرامـــبەر خەڵکـــی نەدارو نزمتـــر، موجـــامەلە کەم دەبووەوە، بۆیە ئەو کەسانەی شوێنگەیەکی بڵندیان

هەیە زەحمەتە خەڵکی وەک حەقیقەتی خۆیان بناسن، چونکە واراهاتوون کە بەزۆری موجامەلە بکرێن و ماستاویان بۆ بکرێ، بەڵام کەسانی نەدارو بەستەزمانی وەک من، ئاسانە بتوانن قوڵایی کەسەکان ئاشکرا بکەن.

هەندێ کەسم دەبینی بەچەشنێکی قێزەون و بەلەخۆباییبونەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکردم، بگرە هەندێ جار بەبێ هیچ هۆیەک غەدریان لێدەکردم لەبەر هۆیەکی زۆر ناچیزە. بەڵام لەهەمان کاتدا کەسانی وام دەبینی بەسۆزو لوتفێکی زۆرەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکردم. نەمدەزانی نهێنیی ئەو جیاوازییەی نێوان ئەو دوو جۆرە هەڵسوکەوتە چییە، بەڵام دواترو کاتێک لێکۆڵینەوەم دەربارەی سروشتی مرۆڤ کرد، ئەو نهێنییەم بۆ ئاشکرا بوو.

### قۆناغێکی تر

پیشەی عەتاری بۆ من گونجاو نەبوو و تیایدا سەرکەوتوو نەبووم، چونکە من هۆگری خوێندنەوە بووم و ئەم هۆگرییەش لەتەک پیشەی دروستکردنی عەتردا نەدەگونجا، بەو پێیەی دەبێ عەتار بەردەوام لەدوکاندا دابنیشێ و وریاو

چاوکراوە بێت و کڕیار بەلای خۆیدا رابکێشێت و دەبێ بزانێ چۆن سەودایان لەگەڵدا دەکات.

من لەپشتەوەی دوکانەکەدا رەفێکی تایبەتیم هەبوو کتێب و گۆڤارەکانم لەسەر دادەنان، کاتێک وەستاکەم دەچووە شوێنێک، بە هەلم دەزانی و دەستم دەکرد بە خوێندنەوە، ئیدی ئاگام لە کڕیار نەدەماو دوکانەکانی دی کڕیارەکانیان بۆ خۆیان رادەکێشا، وەستاکەم لەم کارەی من زۆر بێزارو دەهری بوو، رۆژێکیان ئاماژەی بۆ رەفەی کتێبەکان کردو بەئامۆژگارییەوە وتی: هەتا ئەو رەفەیە لەوێ بێت من هیچ خێرێک لە تۆ نابینم. دواتر بۆم دەرکەوت قسەکەی راستە، هەر مرۆڤێک ئەگەر بیەوێ لە پیشەکەی یان لە کارەکەیدا سەرکەوتوو بێت، پێویستە هەموو زەین و بایەخی خۆی بخاتە سەر کارەکەی، دەنا سەرکەوتوو نابێت و وەک ئەو پەندە میللیەی کە دەڵێ هەردوو رۆیشتنەکەی بیر دەچێتەوە.

رۆژێکیان لەکۆتایی ساڵی ١٩٢٩ بوو، هەستم کرد وەستاکەم ئارامی لێ براوەو ئەوەندەی نەماوە لەدوکان دەرم بکات، ئیدی منیش وام پێ باش بوو خۆم دەرچم و واز لەدوکان بێنم پێش ئەوەی ئەو دەرم بکات. کاتێکیش راوێژم بە دایک و باوکم کرد،

وتیان بە ئارەزووی خۆت چی ئەکەی بیکە، ئەمە یەکەمین جار بوو دایک و باوکم ئازادیی هەڵبژاردنم لەژیانی خۆمدا بدەنێ. ئیدی منیش دوودڵ و دەستەوەستان بووم و نەمدەزانی چی بکەم.

قەدەر وای هێنا ئێوارەی ئەورۆژە بەڕێز سەید جەعفەر عەتیفە لەماڵەکەی خۆیدا ئاهەنگێکی گۆرانیی ساز کرد بەبۆنەی ژنهێنانی (عەبدولڕەزا)ی کوڕەزای. بۆم ڕەخسا منیش لەگەڵ کەسانی دی لەو ئاهانگەدا ئامادە بم، لەوێدا گوێم لەو پێشبڕکێی گۆرانییە گرت کە لەنێوان گۆرانیبێژی ناودار محەمەد قەبانچی و گۆرانیبێژێکی تر بەناوی سەلمان شەکەرچی ساز کرا. ئەم پێشبڕکێیە هەستی وروژاندم و وای لێکردم سوور بم لەسەر جێبەجێ کردنی ئەو بڕیارەی ماوەیەک بوو دوودڵ بووم لێی. پاش تێپەڕبوونی چەندین ساڵ جارێکیان وارێککەوت محەمەد قەبانچیم بینی و پێم وت کە بێئەوەی پێ بزانێت چاکەیەکی لەگەڵدا کردووم، ئیدی باسی گۆرانییەکانی ئەو شەوەم بۆ گێڕایەوە، هەردووکمان بە گاڵتەجاڕییەکانی قەدەر پێکەنیین.

پاش چەند هەفتەیەک لەو پێشبڕکێی گۆرانییە، نەمدەزانی چی بکەم و بۆ کوێ بچم. لەکرێی

کـــارەکەی پێشـــوومدا نـــزیکەی حەفتـــا روپـــیەم کۆکردبـــووەوە، بریـــارم دا بەو پـــارەیە دوکـــانێکی بچوکی عەتـاری و عەترفرۆشـــی بـکەمەوە، لەمەدا ســـەرکەوتوو بـــووم و بـــۆم رەخســـا لەیەکێـــک لە کۆلانەکانـدا دوکانێک بە کرێ بگرم، ئیدی هەنـدێ کەرەستەی عەتاریم تیادا دانا لەگەڵ تەرازوویەکی بچووک، کرێی مانگانەی دوکانەکە یەک روپیە بوو، واتە حەفتاو پێنج فلس. ئێستاش ئەو دوکـانە ماوەو جاروبار سەری لێدەدەم و رۆژانی رابردووم بیر دەکەوێتەوە.

یەکێک لە رێکەوتە سەیروسەمەرەکان ئەوەبوو کە قەیرانی ئابووریی جیهانی لەو کاتەدا رووی دا کە من بووم بە عەتار، ئەو قەیرانەش قەیرانێکی زۆر توند بوو زۆربەی وڵاتانی گرتەوە لەوانە بێگومـان عێراقیش. ئیدی بازاڕ برەوی نەماو شتەکان بێنرخ بـوون و ژمـارەیەکی زۆری بازرگـان مـایەپووچ بوون. کەچی من زۆر کەم کاریگەریی ئەو قەیرانەم بەرکەوت.

بەهەرحـاڵ ئەو قۆنـاغەی ژیـانم جیـاواز بـوو لە قۆناغەکانی پێشووم، لەبەر ئەوەی من ئیدی ئـازاد بـووم و بەئارەزووی خۆم دەمخوێندەوە بێئەوەی کەس رێگەم لێبگرێ یان گلەییم لێبکات. هەروەهـا

ئازاد بووم لەوەی کەی بمەوێ دوکان بکەمەوەو کەی بمەوێ دایبخەم و کەی بمەوێ بەئارەزووی خۆم بچم بۆ بەغدا بۆ کڕینی کتێب و گۆڤار.

لە بەغدا بازاڕێکی تایبەتی هەبوو بۆ فرۆشتنی کتێب و گۆڤار پێیان دەووت (بازاڕی سەرای)، بۆیە ئەو ناوەیان لێنا چونکە نزیک بوو لە سەرای حکومەت. من زوو زوو سەرم لێدەدا بۆ کڕینی کتێب و گۆڤار. بەڵام پتر بەلای کڕینی گۆڤارە کۆنەکاندا دەچووم چونکە هەرزان بوون، لەتەک هەرزانییەکەیدا بابەتی فکریی مەزنیان تیادا بوو.

پتر هۆگری گۆڤارە میسرییەکان بووم بەتایبەتی گۆڤاری (الهلال) و گۆڤاری (المقتطف). ژمارە کۆنەکانی ئەو دوو گۆڤارە لە بازاڕی سەرادا هەبوون، چەندین ژمارەم لێ کڕین، تا ئەمڕۆش هەندێکیانم لەلادا ماون.

من لە دوکانەکەمدا زۆر گوێم نەدەدایە کڕیارەکان، سا ژمارەیان زیادی بکردایە یان کەمی بکردایە بەلامەوە گرنگ نەبوو، بەڵکو بایەخی سەرەکیی من کەوتبووە سەر خوێندنەوەی کتێب. ئەم نەریتە بەرەو ئەوەی بردم کە هەوڵ بدەم دەست بکەم بە نووسین، وەک لاساییکردنەوەی هەندێ لەو نوسەرانەی کتێبەکانم دەخوێندنەوە.

ئیدی وتارەکانم دەنارد بۆ رۆژنامەو گۆڤارەکانی بەغدا، چارەنووسی زۆربەیان فەرامۆشکردن و بڵاونەکردنەوە بوو، کەمێکی زۆر کەمیان لێ بڵاو کرایەوە.

ئەو وتارانەی لەساڵی ١٩٣٠دا بڵاو کراونەتەوە ئەمرۆ جێگەی شانازیی منن. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە من نزیکەی شەست ساڵ لەمەوپێش دەستم بە نووسین کردووە، ئەمەش ماوەیەکی درێژەو پڕە لە ئەزموون. دەشێ لە بەشەکانی تری ئەم بیرەوەرییانەدا باسی هەندێ لەو ئەزموونانەو لە نیازە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانی بکەم، بەپێی کۆششەکانی خۆم لەو کاتەدا، لەرووی سایکۆسۆسیۆلۆجییەوە، لێی بڕوانم.

## بەشی هەشتەم:
## ڕووداوی سەحنەکە

مەبەستم لە سەحن ئەو گۆڕەپانە فراوانەیە کە لە سێ لاوە دەوری مەرقەدی کازمیەی گرتووە، لەبەشەکانی پێشودا زیاد لە جارێک ئاماژەم پێداوە، شورەیەکی بڵندیش لەدەوریدا هەیە کە چەندین ژوورو هەیوانی تێدایە، هەروەها چەندین بالکۆنی فراوان لەسەر ژوورو هەیوانەکاندا هەن.

لە ڕۆژی عاشورای هەموو ساڵێک، لەو سەحنەدا ئاهەنگێکی گەورە ساز دەکرێت بۆ زیندووراگرتنی کوشتنی حوسەین بن عەلی، لەوێدا مەوکیبی لەخۆدان و زنجیر بەخۆداکێشان دەست پێدەکات، پاشان چۆنێتی کوشتنی حوسەین نمایش دەکەن بەو شێوەیەی وەک هەمیشە ئەو نواندنە ئەنجام دەدەن. لەو ڕۆژەدا بالکۆنەکانی شوراکە پڕ دەبن لە ژنان، ژوورو هەیوانەکانیش پڕ دەبن لە پیاو.

لە ١٠ی تەموز/یۆلیۆی ساڵی ١٩٢٧دا ڕۆژی عاشورا هات، من ئەو کاتە تەمەنم چوارده ساڵان بوو، هەر لەبەیانی زووەوە لەگەڵ باوکمدا هاتین بۆ سەحنەکە، لەیەکێک لە هەیوانەکاندا لەتەک کەسانی دیدا شوێنێکمان بۆ خۆمان گرت، بەڵام لەو ڕۆژەدا

لەناکاو دیمەنێکمان بینی پێشتر شتی وامان نەدیبوو، چەندین ڕیزی سەربازی بێ چەک لە باشووری سەحنەکە وەستابوون، واتە لای قیبلە.

پێدەچوو حکومەت نیازێکی خراپی نەبووبێ لەهێنانی ئەو سەربازانە بۆ ناو سەحنەکە، ویستوویەتی شتێکی وابکات سەربازانیش بەشداریی خەڵکەکە بکەن لەدەربڕینی خەم و ناسۆری بۆ حوسەین. بەڵام خەڵکەکە بەشێوەیەکی خراپ ئەو هاتنەیان راڤە کرد، هەروەک ئەمە عادەتی هەموو بەشەرێکە کاتێک قینی لەدڵ بێت، ئیدی بەگوێی یەکتردا دەیانچرپاندو قسەوقسەڵۆکی هەمەچەشنیان دەخوڵقاندو زیادەڕۆییان دەکرد.

لەسەرەتادا ڕێکردنی بەکۆمەڵ (مەوکیبەکان) ئاسایی بوو، هەر کە ڕێکردنی مەوکیبەکان تەواو بوو و خەریک بوو نواندنی کوشتنی حوسەین دەست پێبکات، گوێمان لە تەقەی دەمانچە بوو لەشوێنێکەوە هات نەمانزانی کوێ بوو، پاشان هەندێ لەو خەڵکەی دارو کوتەکیان بەدەستەوە بوو، پەلاماری سەربازەکانیان دا. ئەو هەیوانەی من تیایدا دانیشتبووم نزیک بوو لە سەربازەکانەوە، بەچاوی خۆم بینیم دار بەدەستەکان پەلاماری سەربازەکانیان دەدا بێئەوەی سەربازەکان چەکیان پێبێت و بتوانن داکۆکی لە خۆیان بکەن، بۆیە

سەربازەکان ناچار بوون نیتاقەکانی (پشتوێنی عەسکەری)ی خۆیان بکەنەوەو بەرگری لەخۆیان بکەن.

لە سەحنەکەدا چەند پیاوماقوڵێکی شارۆچکەکە دەرکەوتن و هەوڵیان دەدا پارێزگاری لە سەربازەکان بکەن تا لێیان نەدەن، بەسەر خەڵکەکەدا هاواریان دەکردو دەیانووت سەربازەکانیش وەک ئێوە موسڵمانن، بەڵام ئەم قسانە هیچ کارێکی لەوان نەکرد، چونکە حەماس و هەڵچوونی گێرەشێوێنی و ژاوەژاو (غەوغائی)کە بەسەر خەڵکەکەدا زاڵ بوو، وای لێکردبوون تێنەدەگەیشتن چی دەڵێن. ئەفسەرەکان دەمانچەیان پێبوو و بەکاریان دەهێنا بۆ بەرگریکردن لەخۆیان و لە سەربازەکانیش، پۆلیسەکانیش هاتنە ناوەوەو ئەوانیش بە تفەنگەکانیان تەقەیان دەکرد، کاتێک شەڕەکە تەواو بوو، دەرکەوت چوار کەس کوژراوە، سێ کەس لە خەڵکەکەو یەکێکیش لە سەربازەکان، بەڵام ژمارەی بریندارەکان زۆر بوون کە زۆربەیان سەرباز بوون.

پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی کەم بەسەر کۆتاییهاتنی شەڕەکەدا، دەست کرا بە ناشتنی یەکێک لە سێ خەڵکە کوژراوەکە کە ناوی (محمد بن عبود المزین) بوو، تەرمەکەیان هێنایە

سەحنەکەو خەڵکێکی زۆریش لەدوایەوە بوون. لەپێشی هەموویانەوە شێخ حەسەن شێخ مەهدی خالصی دەڕۆیشت و هاواری دەکرد: (بڕوخێ ئینگلیز! بڕوخێ فەیسەڵ)، ئیدی بەردەوام جنێوی بە حکومەت دەداو دەستی بۆ پۆلیسەکانی ناو سەحنەکە درێژ دەکردو دەیووت: ئەوانەی لەوێدا وەستاون جولەکەو نوصرانین. کاتێکیش ویستیان تەرمەکە لە سەحن دەربێنن تا بیگوازنەوە بۆ نەجەف، یەکێک لە پۆلیسەکان لەبەردەمی دەرگای سەحنەکەدا وەستا و هەوڵی دەدا نەهێڵێت بێنە دەرێ، شێخ حەسەن بەسەریدا نەڕاندی و لێی پرسی کێ فەرمانی پێکردووی ڕێگریمان بکەیت، پۆلیسەکەش وەڵامی دایەوەو وتی: ئەو کەسەی فەرمانی پێکردووم جێگری بەڕێوەبەری پۆلیسە. ئیتر شێخ حەسەن قیڕاندی: نەفرەت لە جێگرو نەفرەت لە حکومەت کە ئێوەی هێناوە بۆ ئێرە هەی گەوادینە.

### هۆکاری ڕاستەوخۆ

ڕووداوی سەحنەکە (یان: حەوشەو گۆڕەپانەکە) کۆمەڵێک دەرەنجامی کۆمەلایەتی و سیاسیی کاریگەری لێکەوتەوە، هەر تووێژو گروپێک لە

خەلکی، بەئارەزووی خۆیان راڤەیان بۆ دەکرد، ئەم رووداوەش وەک هەر رووداویکی تری میژوویی، هەر دەبی دوو هۆکاری هەبیت، هۆکاریکی راستەخۆ و هۆکاریکی ناراستەوخۆ، لەراستیدا هۆکاری راستەوخۆ وەک ئەو پریشکە ئاگرە وایە کە لەنیو دارو چیلکەدا گڕ دەگریت، بەلام هۆکاری ناراستەوخۆ بریتییە لەبوونی داروچیلکەکان لەنزیکی ئاگرەکە.

هۆکاری راستەوخۆی رووداوی سەحنەکە، وەک لە زاری خەلکیدا بیستم، دەشیت بەم رووداوە دیاریی بکەین: ئامری ئینزیباتی سەربازی کە ئەفسەریک بوو بەناوی (محیدین سوهرەوەردی)، لەگەل ژمارەیەک ئەفسەری تردا هاتنە ناو سەحنەکە بۆ سەرپەرشتیی سەربازەکان و چاودیریکردنی کاروبارەکانیان، ئەم ئامرە ژنەکەیشی لەگەل خۆیدا هینابوو و لەشوینیکی بەرزو لەیەکیک لە بالکۆنەکاندا جیگەی بۆ کردەوە لەتەک کۆمەلی ئافرەتی دیکەدا بۆ ئەوەی تەماشای مەوکیب (بەکۆمەل ریکردن)ی تازیەباران بکات کە بەنیو سەحنەکەدا رییان دەکرد. ئەو ئافرەتانەی لەتەنیشت و لەنزیکی ژنەکەی ئامردا دانیشتبوون، تیبینیی ئەوەیان کردبوو کە جلوبەرگی ژنی ئامرەکە

سەرنجراکێش و گرانبەهایەو سەربازەکانیش بە بەردەوامی خزمەتیان دەکردو بەدەم داواکارییەکانیەوە دەچوون، هەندێ لە ئینزیباتەکان جاروبار سەردەکەوتنە سەرەوەو خواردن و خواردنەوەیان بۆ دەبرد. ئەمەش بێگومان ئیرەیی (حەسودی)ی لەلای ئافرەتەکانی دی دروست کرد.

وا ڕێککەوت کۆمەڵێ کوڕێژگەی هاروهاج سەرکەوتنە سەرەوەو چوونە ئەو بالکۆنەی کە ژنی ئامرەکەی تیا دانیشتبوو، دەمەقاڵییەک لەنێوان ئەو کوڕێژگانەو هەندێ لە ژنەکاندا ڕوویدا، یەکێک لەژنەکان هاواری کردو کوڕێژگەیەکی بەوە تاوانبار کرد کە گوایە جنێوی بە حوسەینی کوڕی ئیمام عەلی داوە، منداڵەکانی تریش بەکوتەکەکانی دەستیان بەربوونە لێدانی کوڕێژگە تاوانبارکراوەکە، یەکێک لەو ژنانەی لەوێدا دانیشتبوو بەزەیی بە منداڵە لێدراوەکەدا هات و دەیویست داکۆکیی لێبکات و لەژێر دەستی ئەوانی دی دەری بهێنێت، ئیتر بوو بە قیژەقیژو هاوارو هاوارو دەنگ بەرزکردنەوەی ژنان، ئەمەش سەرنجی ئەو پیاوانەی ڕاکێشا کە لەسەحنەکەدا وەستابوون، هەندێ لەو خەڵکانە سەرکەوتنە سەرەوە تا بزانن چی ڕوویداوە، سەربازێک لەسەر قادرمەکان وەستابوو ڕێگریی لێ

کردن، دەستیان کرد بە لێدانی سەربازەکەو لەسەر قادرمەکان هێنایانە خواری، کاتێک گەیشتنە بالکۆنەکەو پرسیاریان کرد چی بووە؟ ئافرەتەکان منداڵە لێدراوەکەیان لەبیر کردو بەدەست ئاماژەیان بۆ ئەو ژنە غەریبە دەکرد، ژنی سوهرەوەردیی ئامر، وتیان ئەم ژنە غەریبە هەر خەریکی پێکەنین و گوڵەبەڕۆژە قرتاندنە، ئەو پیاوە پەرۆش و بەغیرەتانەش بە هەڵچوونەوە قسەی ناشیرینیان بە ژنی ئامرەکە وت و هەڕەشەیان لێکرد، کاتێکیش سوهرەوەردی گوێی لەو هەواوزەنایە بوو، لەگەڵ چەند سەربازێکی تردا سەرکەوتنە سەرەوە بۆ بالکۆنەکە، ئیدی شەڕو پێکدادان لەنێوان ئەمان و خەڵکەکە تردا روویدا، یەکێک لەپیاوەکان بە تیلاکەی دەستی کێشای بە ئامرەکەدا، ئەویش دەمانچەکەی دەرهێناو سێ فیشەکی تەقاند، یەکێک لە فیشەکەکان بەر پیاوێک کەوت ناوی (نەجم بن هادی) بوو و برینداری کرد، بەپەلە گواستیانەوە بۆ نەخۆشخانە بەڵام بۆ رۆژی دوایی مرد.

مومکین نییە رووداوێکی لەو چەشنە هەروا بەئاسانی و بەسەلامەتی تێپەڕێت، ئەمە ئاگرێک بوو داگیرسا، لەتەنیشتی ئەو ئاگرەشدا خەرمانێک دارو چیلکەدار هەیە کە ئامادەیە بۆ گرگرتن، واتە ئەو

پیـــاوە کـــوتەک بەدەســـتانەی لە ســـەحنەکەدا هاتوچۆیـان دەکـرد، چاوەڕێی هەلێکیـان دەکـرد تـا کوتەک و تێلاکانی دەستیان بەکار بێنن.

## هۆکاری ناراستەوخۆ

خەلکــی لەعێراقــدا وا راهــاتبوون هەر شــتێک رووی بدایە، بۆ نمونە وەک رووداوی سـەحنەکە، ئەوا هۆکارەکەیـان دەگەڕاندەوە بۆ ئینگلیزەکـان و دەیانووت ئینگلیز ئەو دۆخەی خولقاندووە. شایانی باسە کاتێک من دواتر تەماشای بەلگەو دۆکیومێنتە بەریتانییەکـانم کـرد لە پەیوەسـتیدا بەم رووداوە، بـۆم دەرکەوت ئینگلیزەکـانیش پێیـان وابـوو ئەو رووداوە پلانـــی مەلیـــک فەیســـەل و دەســـت و پێوەندەکانیتی، ئەوساش ململانێی نێوان ئینگلیزو مەلیـک فەیسـەل لە لـوتکەدا بـوو، ئینگلیزەکـان بەگومـــان بـــوون لە مەلیـــک فەیســـەل و هەمیشـــە تۆمەتباریان دەکرد.

بۆچوونی من بەلای ئەوەدا دەچێ کە رووداوی سـەحنەکە نە خەتـای ئینگلیـز بـوو نەخەتـای مەلیـک فەیسول بوو، پەیوەندیی بەهیچ لایەکیانەوە نەبوو، بەلکو ئەمە دروستکراوی کۆمەلێ فاکتەری دیکەیە،

یەکێک لەو فاکتەرە گرنگانە بریتییە لە گێرەشێوێنی و ئاژاوەچییان (غوغاء)، ئەو گێرەشێوێنانەی کوتەک بەدەست و تێلا بەدەستەکان پێشڕەوییان دەکەن.

هەر کەسێک تەماشای کۆبوونەوەو ئاپۆڕەی جەماوەر بکات لە بۆنە ئاینییەکاندا، بەڕوونی تێبینیی ئەوە دەکات کە مەیلی گێرەشێوێنی و غەوغا تیایاندا بەرجەستە دەبێت، هەروەها تێبینیی ئەوەش دەکات چۆن کوتەک بەدەستان چالاک دەبن و لەنێو جەماوەرەکەدا ڕێدەکەن و کوتەکی دەستیان ڕادەوەشێنن، چاوەڕێی دەرفەت و هەلێک دەکەن تا بەکاری بێنن.

زۆر جار ئەو کوتەک بەدەستانە بەوە وەسف دەکرێن کە کەسانی ناچیزەو بێبەش و بێ پشت و پەنان، ئەمە مانای وایە ئەو جۆرە کەسانە لەڕۆژانی ئاساییدا هەست بە شوێنی نزمی خۆیان دەکەن لەرووی پلەی کۆمەلایەتییەوە، بۆیە لە بۆنە ئاینییەکاندا چاوەڕێی دەرفەت دەکەن تا شوێنی کۆمەلایەتیی خۆیان بەرز بکەنەوەو رۆلی خۆیان پیشان بدەن، بۆیە دەبینین لەکاتی وادا ئەو کوتەک بەدەستانە بەفیزو لەنجەولارەوە ڕێدەکەن و شانازی بە تێلاکەی دەستیانەوە دەکەن و پال بە

خەڵکیەوە دەنێن بەبیانووی ئەوەی راسپێردراون ریزی خەڵکی ریک بخەن و قەرەباڵغی کەم بکەنەوە. هەر ئەوەندە یەکێک سەرپێچییەکی بچووک بکات، بەتایبەتی ئەگەر کەسێکی بێدەسەڵات و هەژار بێت، ئەوا دەمودەست کوتەک بەدەستێک جنێوی پێدەداو و تیلاکەی بۆ بەرز دەکاتەوەو لەوانەیە تێروپڕی بکوتێ، بەتایبەتی ئەگەر بزانێ هەڵویستەکە گونجاوەو خەڵکیش چاویان بڕیوەتە ئەم و هانی دەدەن، ئیدی ئەوەندەی تر حەماس دەیگرێ و خۆی بە گرنگ دێتە پێش چاو.

نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێ کە ئەو جۆرە کەسانە بەتەنها بێبەش نین لە شکۆو خانەدانی و پشت و پەنا، بەڵکو لەرووی سێکسیشەوە زۆر برسین، ئەمانە لە بۆنە ئاینییەکاندا دەرفەتێک دەدۆزنەوە بۆ تێرکردنی هەستی سێکسییان، بەتایبەتی ئەو کاتەی دەبینێت ژنان لە بالکۆنەکانەوە تەماشای ئەو دەکەن، ئەوەندەی تر پەرۆشی دەیگرێ و خەیاڵی ئەوە دەکات کە بووە بە پاڵەوان و واتێدەگات ئافرەتانیش بەچاوی سەرسامی و سەرسوڕمانەوە لێی دەڕوانن.

ئێمە ناتوانین بەدروستی لە رووداوی سەحنەکە تێبگەین ئەگەر لە کەسایەتیی ئەو کوتەک بەدەستانە تێنەگەین، لێرەدا فاکتەرێکی دی هەیە نابێت غافلگیر بین لێی، ئەوفاکتەرەی سەرجەم خەلکی رەشۆکی گرتبووەوەو بەتەواوی خۆیان ماندوو کردبوو لەوەی کە گوایە ئۆپۆزیسیۆنی سیاسین، وەک پێشتر باسم کرد. دەبینین رەشە خەلکەکە لایەنگریی هەر کەسێک دەکەن کە دژی حکومەت بێت، رقیان لەهەر کەسێک دەبێت لایەنگری حکومەت بێت، ئەم هەلوێستانەیان تەنها لەو کاتانەدا دەردەکەوێت کە مەترسییان لەسەر هەلدەگیرێت، بەلام هەر ئەوەندەی هەست بکەن مەترسییان لەسەرە ئەوا یەکسەر دەگەرێنەوە بۆ باوەرە کۆنەکەیان کە لەسەردەمی عوسمانییەوە پێی راهاتبوون، ئەوەی کە دەلێ: (هەقم چییە بەسەرەوە) و (پەیوەندیی بەمنەوە نییە)، واتە پەیوەندیی بە سیاسەتەوە نییە.

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بلێین خەلکی عەوام و رەشۆک لەکاتی کۆبوونەوە ئاینییەکاندا هەست بە ئازایەتی دەکەن و کەمتر هەست بە ترس دەکەن، بۆیە لەحالەتی وادا مەیلی غەوغا و

گیرەشـــێوێنییان تیـــادا گەش دەبێـــتەوە، ئیـــدی لە کەشێکی وادا لەگەڵ هەموو قیرەیەکدا دەقیـڕێنن و لەگەڵ هەموو بایەکدا هەڵ دەکەن هەروەک ئیمامی عەلی بەو شێوەیە وەسفی کردوون. ڕێک ئەمە ئەو شـــتە بـوو کە لە ڕووداوی ســەحنەکەدا ڕووی دا، هەروەکــو لە چەنــدین ڕووداوی دیکەشـــدا ڕووی داوە وەک لەبەشەکانی تردا دێینە سەری.

## بەشی نۆیەم:
## ڕووداوی چلەکە

لە ساڵی ١٩٢٩دا لە کەربەلا شتێک ڕووی دا، لەڕووی گێرەشێوێنییەوە لە ڕووداوی سەحنەکە دەچوو، بەلام ڕووداوەکەی کەربەلا لەوەدا جیاواز بوو کە مۆرکێکی تەواو کۆمەلایەتیی هەبوو و پەیوەندیی بە سیاسەتەوە نەبوو.

ڕووداوەکەی کەربەلا لە وەرزی زیارەتی چلەدا ڕووی دا، لەو وەرزەدا خەلکی سەردانی مەزاری حوسەین دەکەن بەبۆنەی تێپەڕبوونی چل ڕۆژ بەسەر کوشتنیدا. لەوکاتانەدا کەربەلا جمەی دێت لەخەلکی، لە زۆربەی شارو ناوچە جیاجیاکانی عێراقەوە بۆی دێن. بەکۆمەل ڕێکردن(مەوکیب)ی تازیەباران دوابەدوای یەک دەست پێدەکات، ئیدی لە سنگی خۆیان دەدەن و دەگرین وناڵەو فیغان بەرز دەبێتەوە.

لەساڵی ١٩٢٩دا ئەو سەردانیکردنە کەوتە ڕۆژی ٢٧ی تەموز/یۆلیۆ کە دەکاتە ٢٠ی صەفەری ١٣٤٨ی هیجری، من بۆم ڕەخسا لەو ڕۆژەدا لەگەل خەلکی دیکەدا بچم بۆ کەربەلا. پاش نیوەڕۆی ڕۆژێک پێش چلەکە، لەیەکێک لە شەقامە قەرەباڵغەکاندا دەڕۆیشتم، لەناکاو گوێمان لە دەنگی

تەقە بوو لە شوێنێکی دوورەوە دەهات، خەڵکی لەترسا رایاندەکرد، منیش لەگەڵ ئەواندا رام کردو خۆم لەو ماڵەدا شاردەوە کە تیایدا بووم، نەمزانی چی رووی داوە.

دواجار روون بووەوە کە ناکۆکی و شەڕێکی توند رووی داوە لەنێوان مەوکیبی کازمیەو مەوکیبی نەجەف، لەو شەڕەدا کەسێک کوژرا خەڵکی نەجەف بوو ناوی (دعبول) بوو، ژمارەیەک برینداریش لەهەردوو لادا هەبوو، دواتر خەڵکی نەجەف بریاریان دا کەربەلا بەجێبێڵن تا شەڕەکە گەورەتر نەبێت، ئەمەش کارێکی ئاقڵانەی نەجەفییەکان بوو، کەچی خەڵکی کازمیە پێیان وابوو ئەمە شکستی نەجەفییەکانە، بۆیە دەستیان کرد بە ئەهازیجی سەرکەوتن و شانازی، چەند کەسێک لە خەڵکی کازمیە چوونە خێوەتگای نەجەفییەکان کە کەسی لێ نەمابوو، چەند جزوە قاوەیەکیان لەوێدا رشت، ئەمەش نەریتی دەوارنشینییە کە هۆزی براوە بەسەر هۆزی دۆڕاودا دەیکات وەک نیشانەیەک بۆ سەرکەوتن.

دەگێڕنەوە کە چەند کەسێکی دی هەر لە خەڵکی کازمیە، پاش رووداوەکە، چوونەتە سەحنی عەباس بن عەلی کە نزیک بووە لە مەزاری حوسەینی برای، لەوێ قسەیان لەگەڵ مەزارەکەی عەباسدا

کـــردووەو بەشـــانازییەوە پێیـــان ڕاگەیانـــدووە کە بەســـەر مەشـــهەدییەکان (واتە خەڵکـــی نەجەف)دا ســـەرکەوتوون. دەســـتیان کـــرد بە وتنـــی ئەهـــزوجە (جـۆرە ســـترانێکی کـورتە بە ئـاوازێکی تـایبەتی و هەڵبەزینەوە دەوترێت و لەباشووری عێراقدا باوە ـوەرگێڕ-) لەوئەهزوجەیەدا دەیانووت:

ئەی عەبـاس ئەی عەبـاس هـیچ مەشـهەدیەک لە سەحندا نەماوە

دەعبولمان کوشت و براکانیشی هاواریان دەکرد

(یالعباس یالعباس ما ظل مشهدی بالصحن

قتلنا دعبول وطلعن خواتة يصيحن)

ســـەرلەبەیانیی ڕۆژی دوایـــی (واتە لە ڕۆژی چـلەدا) لە ســـەربانی یەکێـک لەو خانـانەدا شـوێنی خـۆم گـرت کە دەیـڕوانییە ڕێگـای مەوکیبەکـان. لەوێـوە بینـیم خەڵکـی کـازمیە لە یەک مەوکیـبەدا کۆبیـــــــوونەوە، کە بەر لە ڕووداوەکە لەچەنـــــد مەوکیبەیەکـدا دابەش ببـوون، بینـیم ئەمجـارە لە سنگی خۆیـان نەدەدا، بەڵکو دەستیان بڵند کردبوو ئامـــــاژەی ســـــەرکەوتنیان نیشـــــان دەداو ئەم ئەهزوجەیەیان دەچڕی:

حـی روایـا الکـواظم حـی أهالیهـا قاصـده للطفوف تزور والیها

## جێکەوتەی ڕووداوەکە

پـــاش کۆتاییهـــاتنی وەرزەکە کە گەڕامەوە بــۆ کـــــازمیە، رووگەشـــییەکی زۆرم لە روخســـــاری زۆربەی خەڵکە عەوامەکەدا بینــی، جاروبـارو هەر جارەی کەسێک دەهـات و بەدڵخۆشییەوە هەواڵی ئەوەی پێـدەدام کە ناوبانـــگ و ســومعەی کـازمیە لەنێوەنـدی عەشـیرەتەکاندا بەرز بـۆتەوە، چـونکە سـەرکەوتنێکی مەزنیـان بەسـەر خەڵکـی نەجەفـدا تۆمار کردووە.

ڕۆژێکیـــان لە یەکێـک لەدانیشـتنەکانی پرســـەی حوســـەینیەدا لە کـــازمیە دانیشـــتبووم، لەنێـــو ئەودانیشــتنەدا پیـــاوێکی نەجەفیشـــی لێبـوو، بەڵام گاڵتەیان پێدەکردو پێیان رادەبوارد، ئەویش ناچـار ببوو خۆی بگرێت و تەحەمول بکات و بەبێدەنگی بەگاڵتەجاڕییەکانیان قایل بێت، چونکە بەتەنها بوو و کەسی دیکەی نەجەفی لێ نەبوو پشتی بگرێت. مـن هەوڵـم دا داکـۆکیی لێبکەم بە پاسـاوی ئەوەی ئـیمە لەپرســـەیەکدا دانیشـــتووین کە دەبــێ باســـی حوسەینی شـەهید بکەیـن و نابێت لەنێوان خۆماندا نـــاحەزی بخــــولقێنین وەک ئەوەی عەشـــیرەتەکان دەیـــکەن و لەراســـتیدا ئەمە نەریتـــی ســــەردەمی جاهیلییە. بەڵام ئامادەبووان گاڵتەیان پێکردم ڕێک وەک ئەوەی گاڵتەیـــان بە نەجەفیـــیەکە دەکــــرد،

منیشـیان وەک ئەو بە شـەپەلاخ نـاو بـرد. منـیش سـەرم کـز کـردو بێدەنگ بووم و ئەو پیاوەم بـۆ پێڕابواردنی ئەوان وازلێهێنا.

دوژمنایەتیی نێوان خەلکی کازمیەو نەجەف تا چەنـدین سـالی پـاش رووداوەکەش هەر بەردەوام بوو، خەلکی نەجەف داوای تۆلەسەندنەوەی خوێنی (دعبول)یان دەکرد، ئەو کوڕە گەنجە نەجەفیەی لە رووداوی چلەکەدا کوژرا.

لەسـالی ١٩٤٥دا چەنـد پیاوماقولێکی خەلکـی کـازمیە لەمـالی یەکێکیانـدا کۆبـوونەوە بـۆ وتـوویژکردن سـەبارەت بە کۆتاییهێنـان بە دوژمنـایەتی و تۆلەسـەندنەوەی نێـوان ئەو دوو شـارۆچکەیە. لەو کۆبـوونەوەیەدا نـاکۆکییەک دروست بوو سەبارەت بەوەی کام لایان بچێت بۆ لای ئەویدی و داوای سولح و ئاشتبوونەوە بکەن. دواجار لەسەر ئەو رایە گیرسانەوە کە پرسیار لە کەسێک بکەن شارەزا بێت لە نەریتی عەشایەری بۆ یەکلاییکردنەوەی ئەو ناکۆکییە، بریاریان دا بچن بۆ لای شێخ حەسەن السهیلی سەرۆکی عەشیرەتی بەنـی تەمـیم، دادوەرییـان بـۆ بکـات، لەپـاش کۆبوونەوە لەگەل ناوبراودا، وتـی: ئەو لایەنەی کە مەسـینە (جـزوە) قـاوەکەی بەسـەر خێوەتگـای ناحەزەکەیـدا رشـتووە دەبـێ ئەوان بچـن بـۆ لای ناحەزەکەیـان و داوای چـاکبوونەوەو ئاشـتییان

لێبکەن. خەڵکی کازمیە بەو دادوەری و ناوبژییە رازی نەبوون چونکە ئەمان بوون قاوەیان بەسەر خێوەتگەی نەجەفییەکاندا رشت وەک پێشتر ئاماژەم پێدا. دواتر بۆچوونێکی وایان پێشنیاز کرد کە چاکبوونەوەو سوڵح لە کەربەلادا بکرێت و هەردوو لایەنە ناحەزەکە لەوێدا کۆببنەوە، بەلام خەڵکی نەجەف بەم بۆچوونە رازی نەبوون، چونکە ئەمە پێچەوانەی نەریتی عەشایەرییە.

تۆڵەسەندنەوەی (دعبول) تا ئێستاش وەک خۆی ماوەتەوە.

**راڤەکردنێکی سۆسیۆلۆجی**

هۆکاری راستەوخۆی رووداوی چلەکە بریتی بوو لە روودانی دەمەقاڵێ و سووکەشەڕێکی نێوان خەڵکی کازمیەو هەندێ کەس لە خەڵکی نەجەف دەربارەی ئەوەی مەوکیبی کام لایان پێشتر بڕوات، هەر یەکێک لەو دوو تیپە باوەڕی وابوو خۆی لەپێشترە بۆ ئەو پێشکەوتنە، کاتێکیش لەبەر ئەم هۆیە بوو بە شەڕیان و یەکتریان کوشت، بیریان چوو کە ئەمان بۆ زیندووڕاگرتنی یادی حوسەین بن عەلی هاتوون، ئەو پیاوەی، بەپێی بیروباوەڕی ئەوان، لەپێناوی ئاییندا خۆی بەخت کرد، ئەمانە لەناکاو لە گریان بۆ حوسەینی شەهیدو لەئاییندارییەوە گۆران بۆ شەڕکەری عەشایەری کە

دەماری هۆزگەرایی بەسەریاندا زاڵ بوو. دەشێ بڵێین مەیلی هۆزگەرایی لەناخیاندا زۆر قوڵتر بوو وەک لە مەیلی ئاینداری.

لەراستیدا رووداوی چلەکە رووداوێکی شازو دەگمەن نەبوو لە کۆمەڵگەی عێراقی و هەروەها ئەو کۆمەڵگایانەش کە لەرووی پێکهاتەی سۆسیۆلۆجییەوە لە کۆمەڵگای عێراقی دەچن، من زۆرجار لەو کەسانەی، لەخۆم بە تەمەنترن، بیستوومە چەندین رووداوی هاوشێوەی دیکە رووی داوە لەنێوان کەسانێک کە خۆیان وەک ئاییندار دەردەخەن، کەچی پاڵنەری راستەقینەیان بریتییە لە پاڵنەری عەشایەری.

بەو بۆنەیەوە رووداوێک دەگێرمەوە کە لەساڵی ١٩١١دا لە بەغدا رووی داوە، پاش ئەوەی ئیتاڵیا هێرشی بردە سەر تەرابلوسی خۆرئاوا (واتە لیبیا) کە ئەوکاتە بەشێک بوو لە دەوڵەتی عوسمانی، لە ٣٠ی ئەیلول/سێپتەمبەری هەمان ساڵدا لە ئیستانبوڵەوە بروسکەیەک دەگاتە بەغداو هەواڵی ئەو هێرشەی ئیتاڵیایان پێڕادەگەیەنێت، داواشیان لێدەکات خەڵکی بۆ جیهادو سەرخستنی دەوڵەتی عوسمانی هان بدەن. پاشان والی (واتە فەرمانڕەوا ـو-) بەیاننامەیەکی دەرکرد و داوا لە خەڵکی

دەكات هەر كەسەو بەپێی توانای خۆی، بۆ سەرخستنی دەوڵەت، خۆی ئامادە بكات.

لەدوای ئەو بەیاننامەیە، چەندین خۆپیشاندان لەشێوەی مەوكیب (كۆڕەو) لە بەغدا دەستی پێكرد، خەڵكەكە ئالایان بەرز كردەوەو تەپڵیان لێدەدا و ئەهازیجی جیهادیان دەوتەوە (ئەهازیج: جۆرە سترانێكی كورت و تایبەتییە بەئاوازەوە دەیڵێن و لەگەڵیدا هەڵدەبەزنەوە، ئەمە لە باشوری عێراقدا باوە -وەرگێڕ-). كاتێك مەوكیبەكان (كۆڕەوەكان) لەنزیك دەرگای باكوری شارەكەدا دەڕۆیشتن، لەنێوان دوو كۆڕەودا شەڕی دەستەویەخە رووی دا، كۆڕەوی (باب الشیخ) و كۆڕەوی (حەیدەرخانە)، ئەم شەڕی دەستەویەخەیە بوو بە شەڕی خوێناوی و كوشت و بڕ، لەكۆتاییدا كۆرەوی باب الشیخ بردیەوە. ئەوانەی لەو كۆڕەوانەدا بەشدارییان كرد بۆ ئەوە هاتبوون لایەنگرییان بۆ دەوڵەتی عوسمانی دووپات بكەنەوە كە لەتێڕوانینی ئەواندا نوێنەری ئیسلامەو لە جەنگدایە لەدژی كافران، بەڵام هەر زوو ئیسلامیان بیرچووەوەو لەنێو یەكتردا كەوتنە شەڕی خوێناوی، رێك وەك ئەو شەڕانەی لەنێوان هۆزە دەوارنشینەكان و گوندنشینەكاندا روو دەدات.

له ٢٠ی كانونی دووه‌م (دیسه‌مبه‌ری) ساڵی ١٩١٢دا له سه‌حنی كازمیه‌دا، رووداوێكی هاوشێوه‌ی دیكه رووی دا به‌بۆنه‌ی رۆژی عاشوراوه له‌نێوان یه‌كێك له گۆڕه‌وه‌كانی كازمیه‌و كۆڕه‌وی به‌غدا له‌لای كه‌رخ. گۆڤاری (لغة العرب) كه له‌و رۆژگاره‌دا له به‌غدا ده‌رده‌چوو، باسی ئه‌و رووداوه‌ی كردووه، لێره‌دا بابه‌تی ئه‌و گۆڤاره‌تان ده‌رباره‌ی ئه‌و رووداوه بۆ ده‌گوازمه‌وه:

(له رۆژی عاشورای ٢٠ی كانونی یه‌كه‌مدا رووداوێكی ناخۆش سه‌ری هه‌ڵدا دڵی هه‌موو كه‌سێكی ئاقڵی خه‌مبار كرد، له‌و رۆژه‌دا هه‌زاران كه‌س له موسڵمانان له كازمیه كۆ ده‌بنه‌وه بۆ یادكردنه‌وه‌ی رووداوی -الطف- (پێیشی ده‌وترێت شه‌ڕی كه‌ربه‌لا كه له‌نێوان ئیمام حوسێنی كوڕی ئیمام عه‌لی و لایه‌نگرانی له‌لایه‌ك و یه‌زید كوڕی موعاویه‌ی سوفیان و سوپاكه‌ی له‌لایه‌كی تر، له‌مانگی موحه‌ڕه‌مدا رووی دا، له‌و شه‌ڕه‌دا ئیمام حوسێن، وه‌ك خۆیان، ده‌ڵێن شه‌هید بوو - وه‌رگێر-)، له‌و رۆژه‌دا چه‌ند گروپێك له خه‌ڵكی كه‌رخ له‌وێ بوون، له‌و ناوچانه‌دا نه‌ریتێكی زۆر خراپ بڵاوه، بۆ نموونه ئه‌گه‌ر له گۆڕه‌پانێكدا خه‌ڵكێكی زۆر كۆببێته‌وه، له‌نێو خۆیاندا له‌یه‌كتر ده‌پرسن تۆ خه‌ڵكی چ شارێكیت، یان تۆ خه‌ڵكی چ گه‌ڕه‌كێك و كام شارۆچكه‌یت، ئه‌ی ئه‌ویتر خه‌ڵكی

کوێییەو..بەم شێوەیە، ئیدی دەمودەست ساردی و ڕقەبەرایەتی لەنێوان خەڵکیی ئەم شارو ئەو شار یان ئەم گەڕەک و ئەو گەڕەک ڕوو دەدات، پاشان ئەم لێکدوورکەوتنەوەیە دەبێت بە قین و جنێودان بە یەکترو دواتریش دەبێت بە شەڕو لێکدان و بگرە هەندێ جار کوژراو و برینداری لێدەکەوێتەوە، ڕێک ئەمە لە کازمیەدا رووی دا، هەر کە هەندێک لەوانەی کازمیە زانییان خەڵکێک هەن لە کەرخەوە هاتوون، یەکسەر کەوتنە مۆڕەکردن لە یەکدی و ئینجا جنێودان و شەڕە بۆکس و دواجاریش یەکدییان بریندار کردو لەیەکتریان کوشت، ئەنجامی شەڕەکەش بریتی بوو لە کوژراوێک و سێ بریندار لە کازمیەو سێ برینداریش لە کەرخ، ئەو کەسەی کوشتنەکەی ئەنجام دابوو لەتەک جەماعەتەکەیدا خرانە زیندانەوە. هیوادارین ئەم رووداوە، بە هیمەتی حکومەت و شەونخونیەکانی، دوا رووداو بێت).

دەشێ لێرەدا جێی خۆی بێت باسی ئەوە بکەم کە باوکم یەکێک بوو لە بریندارەکانی ئەو شەڕە، لە پشتەوە بە خەنجەر لێیان دابوو، ئەوەندەی نەمابوو بمرێت، یەکێک لە سەرتاشەکان بە داودەرمانی تەقلیدی چارەسەری کردو لەمردن رزگاری کرد. ئەگەر ئەو کاتە بمردایە ئەوا بۆ خوێنەریش نەدەرەخسا ئەم بیرەوەرییانە بخوێنێتەوە!.

## بەشی دەیەم:
## لەنێوان ئایین و عەشیرەت..و
## کەسی لاساردا (یان شەقاوە)

ئەو ڕووداوانەی لەبەشی پێشووودا گێڕامنەوە، سەرنج ڕادەکێشن، لەبەر ئەوەی خەڵکی لەو دۆخەدا لەڕووی ڕەفتاریانەوە دووفاقی (دوولانی) بوون، جارێک ئاییندارن و جارێکی دی هۆزگەراو عەشرەتخوازن، ئاشکرایە لێرەدا جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان ڕەفتاری ئایینی و ڕەفتاری عەشایەریدا.

من لەکاتی میرمنالی و سەرەتای گەنجیمدا گوێم بەو جیاوازییە گەورانەی ڕەفتاری خەڵکی نەدەدا، چونکە منیش لە ژینگەیەکی وادا گەشەم کردووەو پێم وابوو ئەمە ڕەفتارێکی سروشتی و ئاساییەو نامۆ نییە. بەڵام کاتێک دواتر سروشتی مرۆڤم خوێندەوەو لێکۆڵینەوەم لەسەر کرد، تێگەیشتم ئەم ڕەفتارە پێویستیی بە شیکردنەوە هەیە، لە ژێر و لەقوڵایی ئەم ڕەفتارە دوفاقیەدا کۆمەڵێ فاکتەری کۆمەڵایەتی هەیە دەیجوڵێنێت.

### بۆچی؟

یەکەم پرسیار لەم ڕووەوە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە، ئەمەیە: بۆچی لەوسەردەمەدا نەریتی عەشایەری بەسەر خەڵکیدا زاڵ بوو؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، دەتوانین بڵێین عێراق لەپاش رووخانی دەوڵەتی عەباسیدا بەقۆناغی داکەوتنی ژیاری (الانحطاط الحضاری)دا تێپەڕی، ئەم داکەوتنە ژیارییە شەش سەدەی خایاند. لەو قۆناغەدا دەسەڵاتی حکومی نەیدەتوانی ئاسایش بەرقەرار بکات و پارێزگاری لە رۆح و شەرەفی خەڵکی بکات، بۆیە خەڵکی ناچار بوون لەو پێناوەدا پەنا ببەنە بەر بەهاکانی هۆزگەرایی و نەریتی عەشایەری، دەبینین چەندین بەهای وەکو دەمارگیریی هۆزگەری و تۆڵەسەندنەوەو جوامێری و پیاوەتی و پەلامارو هێرش و کەڵەگایی و فەرهودو تالانی و شتنەوەی شورەیی (واتە ژنکوشتن) و زۆری دیش تیایاندا گەشەی کردو گەورە بوو. هەر کەسێک سەر بە عەشیرەتێکی بەهێز نەبێت کە پارێزگاری لێبکات و تۆڵەی بۆ بستێنێتەوە، ئەوا دەشێت بەجۆرێک لەجۆرەکان دوچاری غەدرلێکردن و تالانی ببێتەوە، ئەمە بەئەندازەیەکی گەورەتر لە گوندەکاندا رونترو بەرجەستە تر بوو، هەروەک لە شارەکانیشدا هەبوو بەڵام بە ئەندازەیەکی کەمتر.

لەکاتێکدا ئەو بەها عەشایەرییانە لەنێو خەڵکیدا باو بوو، لەهەمان کاتدا چەندین بەهای دیکەش تیایاندا باو و باڵادەست بوو، ئەویش بەهای ئاییني

بوو کە بانگەشەکاران و ئامۆژگارانی مزگەوتەکان و خەتیبەکانی پرسەی حوسەینییە بانگەشەیان بۆ دەکرد، بۆ نموونە بەهای وەکو دادپەروەری و یەکسانی و سەبرو خۆراگری و لێکبووردن و باوەڕداری، کە ئەمانە بێگومان پێچەوانەو دژی بەها عەشایەرییەکانن.

لەسەردەمی عوسمانی و دوای عوسمانیش، منالان لە کۆلانەکاندا کاتیان بەسەر دەبردو یارییان دەکرد، یەکێک لەیارییە گرنگ و خۆشەکانیان یارییەک بوو پێیان دەووت (الکسار)، واتە تێکشکێنەر، واتە شەڕە کۆلان یان شەڕە گەڕەک بە بەرد، شەڕە بەردی نێوان منالانی گەڕەکەکان. منالانی هەر گەڕەکێک لەنێو خۆیاندا گروپێکیان لەشێوەی (عیصابە) دروست دەکرد تا لەگەڵ منالانی گەڕەک و کۆلانەکانی تردا شەڕ بکەن، لەو شەڕانەشدا بەردو دارو کوتەکیان بەکار دەهێنا، خۆ ئەگەر منالانی گەڕەکێک بەسەر گەڕەکێکی تردا سەربکەوتنایە ئەوا تا ماوەیەکی درێژ و زوو زوو دەیانگێڕایەوەو شانازییان پێوە دەکرد.

بیرم دێ لەرۆژگاری منالیماندا، شانازی بەخۆکردن لەنێوماندا لەسەر بنەمای جیاوازیی نێوان (شێر) و (ژنانی)دا دەکرا، شێر ئەو کەسەیە چەند سیفەتێکی هەیە، وەک ئەوەی هەمیشە

دەیباتەوەو هەرگیز نادۆڕێت، دەتوانێ فریو بدات بەڵام فریو نادرێت، وەردەگرێ و نادات، وەسفی زیرەک ئەو کەسە بوو دەیبردیتە سەر رووبارەکەو بەتوێنیتی دەیگەڕاندیتەوە، واتە بە فێڵزانیی خۆی دەتوانێت واتلێبکات لەسەر رووبارەکە بێت و ئاویش نەخۆیتەوە.

ئەو منداڵەی لەسەر ئەو جۆرە بەهایانە پێبگات و گەورە ببێ، دەشێت کەم و زۆر، لە گەورەبوونیشدا پابەندیان بێت، بەڵام گرفتەکە ئەوەیە کە گەورە دەبێت رووبەڕووی ئامۆژگاریی ئایینی دەبێتەوە کە لە مزگەوتەکان و شوێنی تریشدا لەشێوەی خوتبەی دینی پێی دەوترێتەوە، بۆیە دەبینین لە روکاردا کاریگەر دەبێت پێیان و لەوانەیە خۆیشی لەهەندێ بۆنەدا ئەو ئامۆژگارییانە بۆ کەسانی تر دابدات، یان دەشێت لەسەر ئەو بنەمایە رەخنە لە خەڵکی بگرێت، کەچی خۆیشی لە رەفتاری رۆژانەیدا ئەو بەهایانەی بیر دەچێتەوەو پتر رۆدەچێتە نێو ئەو بەها کۆمەڵایەتییە باوانەی تیایدا گەشەی کردووە.

### پایەی (شەقاوە)

زاراوەی (شەقاوە) لەشێوەزاری میللیی عێراقیدا بەرامبەر بە زاراوەی (الفتوە)ی میسری و

(القبضای)ی لبنانییە، شەقاوە پیاوێکی بەهێزەو بەها عەشـــایەرییەکانی تیـــادا کۆبـــۆتەوە بەو پێـــیەی کەسێکی ئازاو براوەیەو دەتوانێت هەڵکوتێتە سەر مـــاڵان و دزی و رێگـــری بکـــات و پـــارە لە دەوڵەمەنـدان بسـێنێ، بەڵام لەهەمـان کاتـدا مەردو جـوامێرو هێرشـبەرە، پیـاوەتیی لەدەسـت دێـت، گەرەکەکەی خۆی لەئاستی دوژمناندا دەپارێزێت و هەرکەسێک هـاوارو پەنـای بۆ بەرێت دەمودەست بەدەمیەوە دەچێت و یارمەتیی دەدات.

یەکێـــک لە شـــەقاوە ناســـراوەکانی کـــازمیە دراوسێی ماڵی سەید موحسینی باپیرم بوو، گوێم لە خزمەکـانم دەبـوو زۆربەی کـات بە باشـی باسـی ئەو شــەقاوەیەیان دەکـرد، پـارێزەری مـاڵی بـاپیرم وماڵەکـانی تـریش بـوو، رێگەی نەدەدا هیـچ دزێـک هەڵکــوتێتە ســەریان، چــونکە پێــی وابــوو ئەمە شـــوورەییە بـۆ ئەو، ئەگەر کەســێک دزیـــی لە مـــاڵی بـــاپیرم وماڵەکـانی تـریش بکـردایە دەبـووە مـایەی کەمبوونەوەی هەیبەت و جوامێری و پیاوەتیی ئەو.

لەمێرمنداڵیمدا دەمبینی شەقاوەکان بەنێو بازاڕو شـەقام و رێگەوبانەکانـدا دەرۆیشـتن، بەشـێوەیەکی تـــایبەتی و جیـــاواز رێیـــان دەکـــردو جلـــوبەرگی جیاوازیـــان دەپۆشـــی، خەڵکـــی بەزیـــادەرۆییەکی ئاشـکراوە سـڵاویان لێدەکردن و بەرادەیەکـی زۆر

ستایشــیان دەکــردن، یەکێــک لەو مێرمنــاڵانەی دەمناســی ئامــانجی گەورەی لەژیانــدا ئەوەبــوو لەگەورەییدا ببێت بە شەقاوەیەکی ناودار. بەڵام من لەم جۆرە ئامـانجەم نەبـوو، چـونکە بونیـادم لاواز بـوو، پێویسـتیش ناکـات ئەوە بڵـێم کە بەهێـزی و توندوتۆڵیی جەستە لەو رۆژگارەدا، یەکێک بوو لە پێداویستییەکانی بوون بە شەقاوە.

رۆژێکیان لە چایخانەیەکی نزیکدا دانیشتبووم و گـوێم بـۆ ئەوانـی تـر شـل کردبـوو کە خەڵکـی کــۆلانەکەی خۆمــان بــوون و قســەیان دەکــرد، قسەکانیشــیان دەربــارەی یەکێــک لەو خــوتبە ئامۆژگارییــانە بــوو کە واعیزێکــی نــاودار لە مزگەوتێکی نزیکدا وتبوویەوە، ئەمان زۆر سەرسام بـوون بەو خـوتبەیەو بەشـێوازە بەلاغـیە جـوان و سەرنجڕاکێشەکەی، بابەتی خوتبەکەش بریتی بوو لەو رەوشــتە جوانــانەی ئیســلام لەگەڵ خۆیــدا هێنـاونی، وەک دادپەروەری و بـاوەڕو خـاکەڕایی و وەلامـدانەوەی چـاکە بەرامـبەر بە خـراپە. ئەوەی سـەرنجی راکێشـام ئەوەبوو لەکاتێکدا ئەوان باسی خوتبەکەیان دەکرد، بینییان لەدەرەوە شـەقاوەیەکی نـاودار بەوێـدا تێپەڕی، ئیـدی دەسـتیان کـرد بە ستایشـکردنی کـارە شـەقاوەییەکانی، یەکێـک لەو

ستایشانە ئەوەبوو کە گوایە جاریکیان حەوت کەسی کوشتووەو ئەمەش یەکێکە لە شانازییە گەورەکانی.

ئێمە لێرەدا لەبەرامبەر دوو کەسایەتیی دژ بەیەک دەوەستین کە هەردوو لایان شوێنی ڕێزو سەرسوڕمانی خەڵکی بوون، یەکێکیان کەسایەتیی واعیزەکەیە کە داوای ڕەوشتی خۆگری و باوەڕ دەکات، ئەویدیکەیان کەسایەتیی شەقاوەکەیە کە ڕەفتارێکی پێچەوانەو دژی ڕەفتاری واعیزەکەی هەیە. لەراستیدا ئەو پیاوە باوەڕدارەی لەژیانی ڕۆژانەیدا پابەندە بە ڕەوشتی ئاینییەوە، شوێن و پایەیەکی بڵندی لەلای ئەواندا هەیە بەجۆرێک هیچی کەمتر نییە لە پایەی شەقاوەکە. هەردوو کەسایەتییەکە زۆر بەرێز بوون لەلایان و بەزیادەوە سڵاویان لێدەکردن و وەڵامی سڵاوەکانیان دەدایەوە، ئەمەش بێگومان دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی دووفاقی لەکەسایەتیی هەندێکیاندا، بەچەشنێک لەلای یەک تاکەکەسدا هەندێ جار وەک کەسێکی باوەڕدار دەردەکەوێ و هەندێ جاری دیش وەک شەقاوە.

تکام وایە خوێنەر پێی وانەبێت ئەم دووفاقییە دیاردەیەکە تایبەتە بە کۆمەڵگەی عێراقی، بەڵکو لێرەدا چەندین کۆمەڵگەی دی هەیە، تەنانەت هەندێ

لە کـــۆمەڵگە پێشـــکەوتووەکانیش، کەم و زۆر گیرۆدەی ئەو چەشنە دووفاقیەن. بۆ نموونە بڕوانە کۆمەڵگەی ئەمریکی چۆن کۆمەڵناسە ئەمریکییەکان تێبینیـی دووفاقییـان لەو کۆمەڵگـایە کـردووە، بـۆ نموونە یەکێک لەو کۆمەڵناسە ئەمریکییانە کەناوی کیمبـۆل یـۆنگە لە کتێبـی (سـایکۆلۆجیای کـۆمەڵایەتی)دا دەڵـێ: لەکـۆمەڵگەی ئـێمەدا دوو سیسـتم لەبەهـای کـۆمەڵایەتی هەیە، یەکێکیـان لە ئاینی مەسیحییەوە وەرگیراوەو دەڵێ پێویستە بەو جـۆرە مـامەڵە لەگەڵ خەڵکیـدا بکەیـت کە خـۆت ئـارەزوو دەکەیـت مـامەڵەت لەگەڵـدا بکرێـت، ئەویتریـان لە ژیـانی ئـابووریی پـڕ لەهەراوزەنـا وەرگیـراوە کە ململانـێ و کێبەرکێیەکـی تونـدی تێـدایە، ئەوکەسـانەی لەژێـر کـاریگەریی ئەم دوو سیستمە دژ بەیەکەدا پێدەگەن، دوچاری کەسایەتیی دووفاقی دەبن.

جیاوازیی نێوان کۆمەڵگەی ئەمریکی وکۆمەڵگەی عێراقـی لەم بـوارەدا ئەوەیە کە دووفـاقی لە کۆمەڵگەی یەکەمیاندا لە دەرەنجامی ناکۆکیی نێوان بەها نەرمەکانی مەسیحیەت و بەها توندوتیژەکانی ئابووریـدا سـەرهەڵدەدات، کەچـی دووفـاقی لەکۆمەڵگەی عێراقیدا لە ئەنجامی دژایەتیی نێوان بەهای ئاییني و بەهای عەشایەریدا سەرهەڵدەدات.

## باوەڕی (شەفاعەت)

باوەڕی شەفاعەت، ئەوساو ئێستاش، یەکێکە لە دیاردە ئاینییە هەرە بڵاوەکانی کۆمەڵگەی عێراقی و ئەوکۆمەڵگایـــــانەش کە لەڕووی پێکهـــــاتەی سۆسیۆلۆجییەوە لەو دەچن.

مەبەســـتم لە شـــەفاعەت چییـــە؟ مەبەســـتم لە شەفاعەت (واتە ڕوولێنان و تکالیکردن-و-) ئەوەیە خەڵکـی پەنـا بەرنە لای قەدیسـێک بەو هیـوایەی لەلای خـوادا بۆ ئەو دونیا (ئاخیرەت) شـەفاعەتیان بۆ بکات تا خوداش لەو گوناهانەیان خۆش بێت کە لەم دونیادا ئەنجامیان داوە. دەتوانین بڵێین هەندێ جار (باوەڕی شەفاعەت) و (دووفاقیی کەسایەتی) دوو مەســـەلەی پـێکەوە بەســـتراون لەژیـــانی کۆمەڵایەتیـــدا. خەڵکـــی لەژێـــر کـــاریگەریی ئەو دووفـاقیەی تیایـدا پێگەیشـتوون، کـۆمەڵێ کـردەوە ئەنجام دەدەن پێچەوانەی ئەو ئاینییە کە باوەڕیان پێیەتـــی. ئەمە ڕێـــک لەعێراقـــدا و لەســـەردەمی عوســـمانی و پـــاش عوسمانیشـــدا ڕووی دەدا، لەو کاتـانەدا خەڵکی شـانازییان دەکرد بە دوژمنکاری وغەدرلێکردن و هەڵکوتانە سەر ماڵان و لاقەکردن، بۆیە هەستیان بەوە دەکرد پێویستیان بە کەسێکە پلەوپایەیەکی بڵندی لەلای خوادا هەبێت تا لەڕۆژی قیامەتدا شەفاعەتیان بۆ بکات و لە عەزابی دۆزەخ ڕزگاریـــان بکـــات، ئەمە یەکـــێکە لەگرنگتـــرین

فاکتەرەکانی سەرهەڵدانی گۆڕ و مەزاری پیرۆز لە کۆمەڵگەدا کە خەڵکی پارەیەکی زۆری بۆ دادەنێن.

خوای گەورە لەقورئانندا دەفەرموێ: (أدعوني أستجب لكم)، واتە بانگم بکەن بەدەنگتانەوە دێم، هەروەها دەفەرموێ: (لا تدعو مع الله أحدا)، واتە لەتەک ناوی خوادا ناوی کەسی تر مەبەن، ئەمەش زۆر روونە کە خودا وەلامی هەر کەسێک دەداتەوە هاواری بۆ بهێنێ بەبێ ئەوەی پێویستی بەکەسێک هەبێت شەفاعەتی بۆ بکات، بەلام خەلکی عەوام لەمە تێنەدەگەیشتن و توانای ئەوەشیان نەبوو تێبگەن، چونکە لەژیانی رۆژانەیاندا لەسەر ئەوە راهاتوون کە ئەگەر کارێکیان لەلای دەسەلاتداراندا هەبێت، ئەوا لەرێگەی کەسێکی ترەوە داوای نێوەندگیری و شەفاعەت دەکەن، یان دیارییەکی بەنرخی پێشکەش دەکەن تا کارەکەیان بۆ جێبەجێ بکات یان پێداویستیەکەیان بۆ دابین بکات. ئەوان لەو باوەڕەدان خوداش وەک فەرمانڕەوایانی ئەم دونیایە تەنها لەرێگەی شەفاعەت و دیارییەوە کارەکەت بۆ جێبەجێ دەکات، بەبێ ئەمانە پێداویستی وداواکارییەکانیان فەرامۆش دەکرێت.

لەراستیدا باوەڕهێنان بە شەفاعەت لەسەردەمی عوسمانیدا، وەک چۆن لەنێو خەلکی عەوامدا بلاو بوو، بەهەمان شێوە لەنێو فەرمانڕەوایانیشدا باو و

بڵاو بوو، وەک بینیمان فەرمانڕەوایانی ئەوسەردەمە لەهەرە فەرمانڕەوا گەندەڵ و بەرتیلخۆرو ستەمکارەکانی جیهان بوون، بەڵام هاوکات لەخەڵکی تر زیاتر خۆیان واپیشان دەدا کە خەریکی دیندارین و سەرقاڵی بنیاتنانی مزگەوت و مەزارگەو شتی لەو چەشنە بوون. بەغدا لەو دەمانەدا بە قۆناغێکی زەمەنیی وادا تێپەڕی هەرچەندە مزگەوت و مەزارگەی پتر بنیات بنرایە، پتر وێرانەیی و گەندەڵی بڵاو دەبووەوە.

## حەسەن کبریت

حەسەن کبریت، لەکۆتاییەکانی سەردەمی عوسمانیدا، یەکێک بوو لە بەناوبانگترین شەقاوەکانی کازمیە، لەسەردەمی داگیرکاریی بەریتانیدا مرد، کە منداڵ بووم بەڕادەیەکی زۆر گوێم لێدەبوو باسی ئەم پیاوەو کردەوە شەقاوەییەکانیان دەکرد.

هەندێ کەس لەو باوەڕەدابوون ئەوپیاوە دوچاری نەخۆشیی سادیزم ببوو، واتە لەزەتی لە کوشتن و خوێنڕشتن دەبینی، ئەو بەوەندە وازی نەدەهێنا کە هەڵکوتێتە سەر ماڵان و ڕێگری بکات و پارە لەدەوڵەمەندان بسێنێ، بەڵکو هەندێ جار قوربانییەکانی دەکوشت، زۆر شتی تری ناخۆشم لەکارە سادیزمییەکانی ئەو پیاوە بیستووە.

لەکاتێکـدا حەسـەن کبریـت خەڵکیـی دەکوشـت و غەدری لێـدەکردن، دڵنیـاش بـوو لەوەی لەپـاش مردنـی، خـودا، بەشـەفاعەتی فـاتیمەی زەهـرای خوشکی پێغەمبەر، دەیخاتە بەهەشتەوە.

یەکێـک لەو کەسـانەی متمـانەم پێی هەیە، بۆی گێڕامەوە کە جارێکیان بەر لەمردنی بە ماوەیەکی کـورت دیدەنیی حەسـەن کبریتی کـردووە، باسـی کـردەوە شـەقاوەییەکانی رابـردووی بـۆ کـردووە، لەحەسەن کبریتی پرسیوە: (تا ئێستا چەند کەست کوشـتووەو چـۆن لەو دنیـادا رووبەڕووی خـودا دەبیـتەوە)، وەڵامـی حەسـەن کبریـت ئەمە بـوو: (لەژیانمـدا زۆر کەسـم کوشـتووە، بەڵام هیـوایەکی گەورەم هەیە بەوەی خـودا، بەشـەفاعەتی فـاتیمەی زەهرا، لە گوناهەکانم خۆش دەبێت، چونکە کارێکم لەپێنـاوی فـاتیمەی زەهـرادا کـردووە، بۆیە ئەوکـارە شایستەی ئەوەیە فـاتیمە لەلای خودا شـەفاعەتم بۆ بکات).

ئەو کارەی حەسەن کبریت بۆ فاتیمەی زەهرای کردووە، دەشێت بەم جۆرە کورتی بکەینەوە:

شـەوێکیان حەسـەن کبریـت لەگەڵ چەنـد شەقاوەیەکی تری هاوڕێیدا لە بەغداد هەڵیانکوتایە سـەر مـاڵی یەکێـک لە دەوڵەمەنـدەکان، کـاتێکیش دزییەکەیـان بەسـەرکەوتوویی تەواو کـرد، حەسـەن

کبریت لەرێگەی گۆڕستانی شێخ مەعروفەوە لە کەرخ، هەر بە پێ گەڕایەوە بۆ کازمیە، ئەو کاتە گۆڕستانەکە چۆڵەوانی بوو و ئاوەدانیی لێوە دوور بوو، حەسەن کبریت لەنێو گۆڕەکاندا گوێی لەدەنگی هاواری کچێک دەبێت و دەپاڕێتەوەو داوای فریاکەوتن لە فاتیمەی زەهرا دەکات، پیاوێکیش هەوڵ دەدا ت لاقەی کچەکە بکات و گوێی نەدەدایە پاڕانەوەی کچەکە، لێرەدا حەسەن کبریت بریار دەدات ئەو پیاوە بکوژێت و کوژراوێکی تر بخاتە سەر ئەو کەسانەی کوشتوونی، بەلام وەک خۆی دەڵێ ئەم پیاوەی لەپێناوی فاتیمەی زەهرادا کوشتووە، لەپشتەوە خەنجەرێک لەکەمەری گیر دەکات و دەیکوژێت، کچەکەش دەباتەوە ماڵەکەی خۆی و بەسەلامەتی تەسلیمی خێزانەکەی دەکاتەوە .

بۆ رۆژی دوایی پۆلیسی کەرخ تەرمی کوژراوەکە دەدۆزنەوەو بەدوای بکوژەکەدا دەگەڕێن، مفەوەزێکی پۆلیس دەچێتە کازمیە بۆ لای حەسەن کبریت چونکە پێشتر دەیناسی، تا داوای لێبکات یارمەتیی بدات لەدۆزینەوەی بکوژەکە، ئیدی مفەوەزەکە لەچایخانەیەکدا حەسەن کبریت دەبینێت و دەچێت بۆ لای، باسی مەسەلەی کوشتنی پیاوەکەی گۆڕستانی شێخ مەعروفی بۆ دەکات، حەسەن کبریت پێی دەڵێ کە بکوژەکە دەناسێت

بەڵام ناوەکەی نادرکێنێت، تەنها ئەو کاتە نەبێ کە مفەوەزەکە بەڵێن بدات بەهیچ جۆرێک بکوژەکە دوچاری گرتن و زیان نەبێت، مفەوەزەکە بەڵێنی پێداو بەپەنجەکانی سمێڵی خۆی دەگرێت و دەڵێ: (بەم شواربە سوێندبێ ناهێڵم بکوژەکە بگیرێت). لەو رۆژگارەشدا سوێند خواردن بە شوارب (سمێڵ) مانای ئەوەبوو کە ئەو کەسە بەڵێنێکی راستگۆیانەو یەکلاکەرەوە دەدات و بەبێ هیچ گومانێک جێبەجێی دەکات. لێرەدا حەسەن کبریت بەتەواوی دڵنیا بوو لەوەی مفەوەزەکە راستگۆیەو بەڵێنەکەی دەباتە سەر، ئیدی تەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، کاتێک مفەوەزەکە گوێی لەو بەسەرهاتەی حەسەن کبریت بوو، پێی وت: (مادام تۆ لەپێناوی فاتیمەی زەهرادا ئەو پیاوەت کوشت، ئەوا دڵنیابە منیش لەپێناوی فاتیمەی زەهرادا هەرگیز ناوی تۆ نابەم).

بەمجۆرە حەسەن کبریت لە سزادان رزگاری بوو.

ئەم چیرۆکە وێنەیەکی روونمان دەداتێ دەربارەی بارودۆخی ژیانی ئەو کاتەی خەڵکی، ئەوان بەپێی بەهای کۆمەلایەتی هەرچییەکیان بویستایە دەیانکرد، بەلام لەو باوەڕەشدا بوون کە خودا، لەرێگەی شەفاعەتی ئەو کەسانەی پایەیەکی بڵندیان لەلایدا هەیە، لە گوناهەکانیان خۆش دەبێت.

## بەشی یانزەیەم:
## بزووتنەوەیەکی چاکسازی و..
## هەرایەك لەسەر کتێبێك

لە پایزی ساڵی ١٩٢٩دا هەرایەکی گەورە لەسەر کتێبێکی بچووک دروست بوو، ئەو کتێبە لە دیمەشقەوە هێنرابوو و لەبازاڕەکاندا دەفرۆشرا، ناونیشانی کتێبەکە: (رسالة التنزيه لأعمال الشبيه) کە دانەرەکەی موجتەهیدێکی شیعیی ناسراوبوو لە دیمەشق دەژیا، ناوی (السيد محسن الامين العاملي) بوو.

کتێبەکە رەخنەی لەو سرووتە ئاینییە شیعییانە دەگرت کە خەڵکی عەوام لەسەری راهاتبوون، ئەو سرووتە شیعییانەی لەمانگی موحەڕەمدا بەبۆنەی یادی کوشتنی حوسەین بن عەلی پرۆسە دەکران، بە بۆچوونی دانەری کتێبەکە، ئەو سرووتانە، جگە لەوەی زیانی بۆ تاک و کۆمەڵگە هەیە، زیانی بۆ سومعەی شیعەش هەیە، دانەری کتێبەکە لەم بارەیەوە وتەیەکی ئیمام جەعفەری صادق دەهێنێتەوە کە دەڵێت: "ئەی شیعەکانی ئیمە، ببن بە زینە بۆمان مەبن بە خەوش، تاوەکو بوترێ کە جەعفەر بن محەمەد رەحمەتی خوای لێبێ باشی کرد کە هاوەڵەکانی بەرەو چاکە برد"، (شیعتنا

كونوا زينا لنا ولاتكونوا شينا لكي يقال رحم الله جعفر بن محمد فقد أحسن ما أدب أصحابه) .

خەڵكی لەئاستی ئەو کتێبەدا دابەش بوون بەسەر دوو تیپی دژ بەیەک، زۆرینە بەرگرییان دەکردو جنێویان بە دانەرەکەی دەدا، کەمینەش لایەنگری بوون. ئەمەش، لەژێر رۆشنایی ئەو زانیارییانەی دەربارەی سروشتی مرۆڤ دەیانزانین، شتێکی سەیر نییە، چونکە هەموو بزووتنەوەیەکی چاکسازی و ریفۆرمخوازی و هەموو جووڵانەوەیەکی نوێخوازی، زۆرینەی خەڵک بەرەنگاری دەبنەوەو رەتیدەکەنەوە، چونکە پێچەوانەی ئەو باوەڕو نەریتانەیە کە زۆرینە لەسەری راهاتوون، واتە ئەو باوەڕانەی لە بابوباپیریانەوە بۆیان ماوەتەوە.

ئەم ململانێیە لەنێوان بەرهەڵستکاران و لایەنگران لە کازمیەدا، زۆر توند بوو، هەندێ جار دەبینرا چەند کەسێک لە خەڵکی عەوام بەدوای ئەو کەسانەدا دەگەڕان کە لایەنگری بانگەشەکەی (السيد محسن الامين) بوون تا ئازاری پێبگەیەنن. لە خوێنەرانی ناشارمەوە کە من یەکێک بووم لە لایەنگرانی ئەو بانگەشەیە، بەڵام ئەمەم لەلای خۆم دەشاردەوەو بۆ کەسم دەرنەدەخست تەنها ئەو

کەسە نەبێ متمانەم پێی هەبوایە، یانی خۆم لە دوژمنکاریی خەڵکی عەوام دەپاراست.

لەنەجەفیشدا ململانێکە توندتر بوو، ئەدیبی ناودار جەعفەر خەلیلی لە کتێبی (بەمجۆرە ناسیمن)دا باسی ئەو ململانێیەمان بۆ دەکات، ئەو بەئاشکرا لایەنگری بانگەشەکەی سید محسن الامین بوو و زۆر بوێرانە لایەنگیریی دەکرد، لەرۆژنامەی (الفجر الصادق)، کە لەو دەمانەدا لە نەجەف دەریدەکرد، وتاری لەسەر دەنووسی و داکۆکیی لێدەکرد.

جەعفەر خەلیلی لەو کتێبەدا دەڵێ: خەڵکی عەوام لە نەجەفدا بە لایەنگرانی بانگەشەکەیان دەووت (ئومەوییەکان) و بە بەرهەڵستکارو نارازییەکانیشیان دەووت (عەلەوییەکان)، ئاوگێڕەکانیش لە عاشورادا هاواریان دەکرد: (نەفرەتی خوا لە ئەمین- ئاو)، لەکاتێکدا پێشتر هاواریان دەکردو دەیانووت: (نەفرەتی خوا لە حرملە- ئاو).

## ناموسی کۆمەڵایەتی

وتارخوێنەکانی (خەتیبەکانی) پرسەی حوسەینیە لەهەموو کەس زیاتر بەرهەڵستیی بانگەشەکەی

(محسن الامین)یان دەکرد، چونکە ئەو لە کتێبەکەیدا رەخنەی لێگرتوون و بەشێوەیەک وەسفی کردوون کە ئەمانە لە خوتبەی پرسەکاندا درۆ دەکەن یان لەگواستنەوەی هەواڵ و رووداوەکاندا زیادەڕۆیی دەکەن تا سۆزی خەڵکی پتر رابکێشن و بیانوروژێنن و وایان لێبکەن بەکوڵ و دڵ بگرین. سید صالح الحلي کە یەکێک بوو لە وتارخوێنە ناودارەکانی ئەو کاتە، لە سەرجەم خوتبەکانیدا هەڵمەتێکی گەورە لەدژی سید محسن الامین دەست پێدەکات. خەڵکیش لەزاری ئەوەوە دوو دێرە شیعریان دەوتەوە کە زەمی سید محسن الامین دەکات:

یا راحلا أما مررت بجلق

فابصق بوجهه امینها المتزندق

سید صالح بەوەندە نەوەستا داوا لە خەڵکی بکات تف لە روخساری سید محسن الامین بکەن، بەڵکو بە (زەندیق)یش وەسفی دەکرد.

زۆربەی زانایانی ئایین هەڵوێستێکی رەخنەیی و نارازییان لەبەرامبەر بانگەشەکەی سید محسن الامین گرتە بەر، چەندین فەتوایان لە دژی دەرکرد کە فەتواکان زیاد لە جارێک چاپ کران، هەروەک سێ کەس لەپیاوانی ئایین چەند کتێبێکیان دەرکرد

بۆ وەڵامدانەوەو بەدرۆخستنەوەی بۆچوون و بەڵگەکانی سید محسن، من ئیستا لە کتێبخانەکەمدا هەموو ئەو فەتواو کتێبانەم پاراستووە کەسەبارەت بەو بابەتە چاپ کراون، هەوڵ دەدەم جاروبار بیانخوێنمەوە، چونکە پێم وایە ئەو بەڵگەنامانە وەک تاقیگە یان نۆرینگەیەک وان سوودیان لێوەردەگرم بۆ لێکۆڵینەوە لە سروشتی بەشەری و مێژووی مرۆیی.

ئێمە کاتێک لێکۆڵینەوە لەو بزووتنەوە چاکسازی ونوێگەرییانە دەکەین کە لەمێژوودا سەریان هەڵداوە، دەبینین سەرجەمیان رووبەڕووی هەمان رەوت دەبنەوە، زۆربەی خەڵک بەرەنگاریان دەبنەوە، ژمارەیەکی زۆر کەم لایەنگیرییان دەکەن، قورئانیش لەچەندین ئایەتدا ئاماژەی بۆ ئەم سروشتەی مرۆڤ کردووە. ئەمە لەراستیدا ناموسێکی بەشەریی گشتییەو سەرجەم کۆمەڵگاکانی دنیا دەگرێتەوە، بەڵام کۆمەڵگاکان لە جۆرو رێژەی بەرەنگاربوونەوەی نوێخوازیدا جیاوازن، هەرچەند کۆمەڵگە داخراو بێت ئەوا بەرەنگاربوونەوەو بەرهەڵستکاری تیایدا توندتر دەبێت.

پیاوێـک دەناسـم بـرادەری یەکێـک لە گەورە پیاوانی ئاینیی ئەو کات بوو، بۆی گێڕامەوە کە ئەو زانا ئاینییە گەورەیە هەڵوێستی بێدەنگیی بەرامبەر بانگەشـەکەی سید محسن الامین هەڵبژاردبوو، نە لەدژی بوو ونە لایەنگریشی بوو، بەڵام لە یەکێک لە دانیشـتنە تایبەتییەکانـدا کەسێک پرسیاری ئەوەی لێدەکات ئـاخۆ رای چییە بەرامـبەر بانگەشـەکەی محسـن الامـین، ئەویش تەماشـایەکی لای راسـت و لای چەپ دەکات تا دڵنیابێت لەوەی کەسی وای تیا نییە متمـانەی پێ نەبێت، پاشـان دەسـتی کرد بە رەخنەگرتن لە سرووتی پرسـەکانی حوسـەینییەو بە (گەمەی منداڵان) وەسفی کرد.

ئەم بۆچوونە کە لەزانایەکی ئاینییەوە دەرچووە، لەراستیدا بۆچوونی زۆر زانای ئاینیی دیکەیە، بەڵام لەترسـی خەڵکـی عەوام نـاوێرن ئاشـکرای بـکەن، چونکە ئەمـانە هەم بـۆ بژێـوی و هەم بـۆ پـایەی خۆیـان پشتیان بە خەڵکی عەوام بەستووە، لەنێو خۆیشـیاندا بەربەرەکـانێ دەکەن بـۆ راکێشـانی زۆرتـرین ژمـارەی ئەو چەشـنە لە خەڵـک، هـیچ یەکێـک لەوانە بـوێریی ئەوە نـاکەن رایەکـی پـێچەوانەی ئەو شـتە بڵـێن کە خەڵکـی عەوام لەسـەری راهـاتووە، لەترسـی ئەوەی لەدژی

بووەستتنەوە یان لێی دووربکەونەوەو بچنە لای ڕکابەرەکەی.

زانای ئاینیش مرۆڤە وەک هەموو مرۆڤەکانی تر، ئەگەر ئێمەش لەهەمان  بارودۆخی ئەواندا بین، وەک ئەوانمان لێدێت.

### فاکتەرە نەستییەکان

لەو ژینگە کۆمەڵایەتییەی تیایدا گەشەم کرد، تێبینیی ئەوم کردبوو ساڵ لەدوای ساڵ ژمارەو جۆری مەوکیبەو سروتی حوسەینییە زیاد دەکات، کاتێکیش گەورە بووم و گەیشتمە قۆناغی پێگەیشتن، ئەم مەسەلەیە لەناخی مندا پرسیاری وروژاند، ئەم پرسیارکردنە لەو دیاردەیە، هەرچەند تەمەنم پتر بوایە، هەمیشە لەزەینمدا دەخولایەوە، ئەمە وای لێکردم کتێبێکی لەسەر دابنێم، ئەو کتێبەی کە نازانم کەی دەتوانم چاپی بکەم و بیخەمە بەر دیدەی خەڵکی.

لێرەدا بواری ئەوەمان نییە زۆر لەسەر ئەم مەسەلەیە قسە بکەین، دەشێت لێرەدا ئەوەندە بەس بێت بەکورتی باسی ئەو فاکتەرە دەروونی و کۆمەڵایەتییانە بکەم کە لەپشتی مەوکیب و

سـروتەکانەوە پەنهـانن، ئەوەی کە دەبێـتە مـایەی گەشەپێدان و هاندانیان.

بەرلەهەرچی نـابێ ئەوەمـان لەیاد بچێ مرۆڤ ئـاژەڵێکی ئاقـڵ نیـیە وەک ئەوەی فەیلەسـوفە دێرینەکـان خەیاڵیـان دەکـرد، بەڵکـو مـرۆڤ لەبیرکردنەوەو رەفتاریدا دەکەوێتە ژێر کاریگەریی چەندین فاکتەری نەستییەوە کە خۆی شتێکی زۆر کەمیـان لێدەزانێت، یـان بگـرە هەنـدێجار هیچیـان لێنازانێت، گرفتەکە ئەوەیە ئەم ئینسـانە وادەزانێت خـۆی ئـازادەو هەمـوو شـتێک بەدەسـتی خـۆی و بەهەڵبژاردنی خۆیەتی، بە ئەقڵ و مەنتیق یاخود بە لۆجیـک و ژیریـی خـۆی دەتوانێـت بیرکـردنەوەو رەفتاری خۆی دیاری بکات.

ئێمە کاتێـک لێکـۆڵینەوە لە کـۆرەو (مەوکیـب) و سرووت (طقوس)ی حوسەینییە دەکەین، بەئاشکرا فاکتەرە سایکۆ-سۆسیۆلۆجییەکانی تیادا دەبینین، ئەم دیـــاردەیە هەروەک چەنـــدین دیـــاردەی کۆمەڵایەتیی دیکە، دەرەنجامی کۆمەڵێ کارکردی (یان: فاکتەری)دەروونی و کۆمەڵایەتیی وەهـان کە خەڵکی هیچ ئیرادەیەکیان لەئاستیدا نییە. سا ئەگەر هەر توێژێکی خەڵکی بکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو

کارکردە نەستییانەوە ئەوا هیچ جیاوازییەکیان نابێت.

لێرەدا هەندێ لەو فاکتەرانە دەخەمەڕوو:

١- گرنگترین فاکتەر لەپەیوەستیدا بەم بابەتەوە، فاکتەرێکە پێی دەوترێت (خەواندنی کۆمەڵایەتی)، ئەم فاکتەرە زۆر گونجاوە بۆ ڕاڤەکردنی سرووتە حوسەینییەکان، هەروەک گونجاویشە بۆ ڕاڤەکردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی تریش. کاتێک مرۆڤ هەر لەمنداڵییەوە لەسەر کۆمەڵێ باوەڕو نەریتی دیاریکراو پێدەگات، پێی وادەبێت باشترین باوەڕو نەریتن لەجیهاندا، ئیدی باسی لایەنە باشەکانی ئەو باوەڕو نەریتانەی خۆی دەکات و لایەنە خراپەکانی بیر دەچێتەوە. سا ئەگەر مرۆڤ لەگەورەبووندا لەسەر هەمان ژینگەی کۆمەڵایەتی بمێنێتەوە ئەوا بەمسۆگەری "خەواندنی کۆمەڵایەتی" بەسەریدا زاڵ دەبێت.

٢- فاکتەری خانەدانی یان پیاوماقوڵیتی، ئەم فاکتەرەش کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لە گەشەپێدانی سرووتە حوسەینییەکان، پیاوماقوڵ و کەسی خانەدان لە کۆمەڵگەدا واهەست دەکات یەکێک لەپێداویستییەکانی مانەوەی بە پیاوماقوڵ و خانەدانیتی بریتییە لەوەی کە لەماڵەکەی خۆیدا

دانیشتنی پرسەی حوسەینییە دابنێت، یان کۆڕەوێک لە پرسەی حوسەینییەدا ببەستێت، هەرچەندێک کۆششی زیاترو پارەی زۆرتر لەو بۆنانەدا خەرج بکات، ئەوا پایەی لەنێو خەلکیدا گەورەتر دەبێت.

٣- فاکتەری خۆخالیکردنەوە، ژمارەیەکی زۆری ئەو کەسانەی لە کۆڕەوە حوسەینیەکاندا بەشداری دەکەن، لەو جۆرە کەسانەن کە (بێبەشن لە پشت و پەنا) یان خزم و خۆیش و عەشیرەتی گەورەیان لەپشت نییە، ئەو جۆرە کەسانە لەرۆژانی ئاساییدا هەست بە نزمیی شوێن و پایەی کۆمەلایەتیی خۆیان دەکەن، بۆیە چاوەڕێی رۆژی مەوکیبە (کۆڕەو)ی حوسەینیە دەکەن تا لەوێدا پایەی خۆیان بلند بکەنەوە، ئیدی دەبینین لەو رۆژەدا لەپێشی پێشەوەی کۆڕەوەکەدا ریدەکەن تا رێکی بخەن، یان تەپڵ لێدەدەن، یان هەر کارێکی تر دەکەن کە ببێتە مایەی سەرنجڕاکێشانی ئەوانیدی و بەمەش ناخی خۆیانی پێ دەگەشێننەوە، کاتێکیش ئافرەتان لەو سروتانەدا ئامادە دەبن و تەماشای کاروانی کۆڕەوەکان دەکەن، ئەوا ئەو گەشانەوە خودییە دەگاتە ئەوپەڕی، لێرەدا ئەو کەسانە بەو جۆرە وێنای خۆیان دەکەن کە بوون بە پیاوێکی شکۆدار و سەرنجڕاکێش و کەس نایانگاتێ.

٤- فاکتەری شەفاعەت: ئەمە ئەوفاکتەرەیە کە لەبەشەکەی پێشوودا قسەم لەسەری کرد، بەشداربوانی کۆڕەو و پرسەکان لەو باوەڕەدان فاتیمەی زەهرا تەماشایان دەکات و سوپاسگوزاریان دەبێت کە لەپرسەی حوسەینی باوکیدا هاوخەمی دەردەبڕن، بەمسۆگەری فاتیمەی زەهرا لەرۆژی قیامەتدا شەفاعەتیان بۆ دەکات، هەروەها پێغەمبەر خۆیشی شەفاعەتیان بۆ دەکات چونکە باپیری حوسەینە، پێغەمبەریش حوسەینی زۆر خۆشدەویست.

٥- فاکتەری نەزر، ئەم فاکتەرە لەرووی ناوەرۆکی هەردوو فاکتەری دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە لە فاکتەری شەفاعەت دەچی، خەلکی واراهاتوون بەڵێن بە کەسێکی پیرۆز بدەن کە دیارییەکیان پێشکەش بکەن ئەگەر لەلای خودا شەفاعەتیان بۆ بکات و ئەو شەفاعەتە ببێتە مایەی بەدیهێنانی خواستەکانیان یان یەکێک لە خواستەکانیان لەم دنیادا، بەمە دەوترێت: (نەزر)، زۆر کەس نەزر بۆ حوسەین بن عەلی دەکەن بەوەی خوانێک یان پرسەیەکی بۆ ئامادە بکەن، یان بەشداری لە کۆڕەوێکدا بکەن یان هەر شتێکی تر، بێگومان هەندێ کەس لەبەدیهێنانی پێداویستیدا

سەرکەوتوو دەبن و خواستێکیان دێتەدی، ئیدی ناچار دەبن بەڵێنەکەی خۆیان جێبەجێ بکەن و بەهەر شێوەیەک بێت دەبێ نەزر پێشکەش بکەن (لە کوردیدا دەوترێت ئەهتی کردووە یان ئاهی کردووە کە نەزر پێشکەش بکات -و).

ئێمە نابێ بەردەوام گلەیی لەخەڵکی بکەین لەسەر ئەو کردەوانەی پێی راهاتوون و ئەو باوەڕو نەریتانەی لەسەری پێگەیشتوون، ئەمە لەراستیدا لەخواست و ئیرادەی خۆیاندا نییە، سا ئەگەر ئێمەش لەهەمان ژینگەو هەمان بارودۆخدا پێبگەیشتینایە ئەوا وەک ئەوان دەبووین.

## بەشی دوانزەیەم:
## جارێکی تر گەڕانەوە بۆ خوێندن

لە بەشەکانی پێشوودا باسی ئەو گۆڕانکارییانەم کرد کە لە ڕەوتی ژیانی مندا ڕوویانداوە، ئەوانەی دواجار بەرەو ئەوەیان بردم ببم بە عەتار یان عەترفرۆش لەیەکێک لەدوکانەکانی کۆڵانێکی تەسکی کازمیە. لەم بەشەدا باسی ئەو بەسەرهاتانە دەکەم کە دوای ئەوە بەسەرم هاتوون، واتە ئەو کاتەی وازم لە عەترفرۆشی هێناو جارێکی تر گەڕامەوە بۆ قوتابخانە.

لە ئێوارەی ڕۆژێکی پاییزی ساڵی ١٩٣١دا لە دوکان بووم، یەکێک لەو کەسانەی کاتی خۆی لە قوتابخانەی سەرەتایی پێکەوە بووین، هاتە لام و هەواڵی پێگەیاندم کە خەریکە لە کازمیەدا قوتابخانەیەکی سەرەتایی ئێواران دەکرێتەوە، هانی دام بچمە ئەو قوتابخانەیە، ئەو بەبێ مەبەست و هەروا بە سەرپێیی و ڕاگوزەر ئەو قسەیەی کرد، نەیدەزانی ئەم هەواڵە بۆ من دەبێتە خاڵی وەرچەرخان لە ژیانمدا، خۆیشم نەمدەزانی بەو شێوەیە ژیانی داهاتووم دەگۆڕێت.

ڕۆژێکیان چوومە بەشی کارگێڕیی ئەو قوتابخانەیە تا ناوی خۆم تۆمار بکەم، بەڕێوەبەرەکە دەیناسیم چونکە یەکێک بوو لە

مامۆستاکانی ئەو قوتابخانە سەرەتاییەی پێشتر قوتابی بووم تیایدا، بەڕێوەبەرەکە خۆشحاڵی دەربڕی و بەخێرهاتنی کردم، بەڵام هاوکات داوای لێبووردنی کرد کە قوتابخانەکە پۆلی پێنجەمی تیادا نییە چونکە ژمارەیەکی زۆر کەم ناوی خۆیان تۆمار کردووە، ئەمە وای لێکردم واز لەو بیرۆکەیە بهێنم نەچمەوە بۆ قوتابخانە، لێرەدا جارێکی تر قەدەرو چارەنووس ڕۆڵیان لەژیانمدا بینی، بەڕێوەبەرەکە وەک سۆزو بەزەیی هاتنەوەیەک بە من بڕیاری دا لەپۆلی شەشەم وەربگیرێم و وتی خۆم بەرپرسیاریتی ئەو بڕیارەم هەڵدەگرم، ئەمە چاکەیەکی ئەو بەڕێوەبەرەیە کە هەرگیز لەیادی ناکەم.

لەپۆلی شەشەمی سەرەتاییدا دەستم بەدەوام کرد، تیایدا سەرکەوتم و بڕوانامەیەکم بەدەست هێنا بۆم هەبوو بچمە قوتابخانەی ناوەندییەوە، لێرەدا بڕیارم دا بۆیەکجاری دوکانەکەم بفرۆشم و بەتەواوی خۆم بۆ خوێندن و قوتابخانە تەرخان بکەم. ئەو بڕە پارەیەی لە فرۆشتنی دوکانەکەدا دەستم کەوتبوو یارمەتییەکی باشی دام تاماوەیەکی درێژ لە خوێندن بەردەوام بم.

لەو دەمەدا لەکازمیە قوتابخانەی ناوەندی نەبوو، ئیدی چوومە ناوەندیی کەرخ، هەموو ڕۆژێک بە گالیسکەی ترامەوای (کە ئەسپ ڕایدەکێشا)

دەچـــوومە قوتابخـــانە. لەراســـتیدا ئەو قۆنـــاغە بەختەوەرتـــرین قۆنـــاغی ژیـــانم بـــوو، وام هەســـت دەکرد سەرلەنوێ ژیاومەتەوە.

### گۆڕینی جلوبەرگەکانم

مـانگی تشـرینی یەکەم/ئۆکتۆبەری سـاڵی ١٩٣٢ مـانگێکە بـایەخێکی گرنگی لەژیـانی منـدا هەیە، لەو مـانگەدا لە قوتابخـانەی ناوەنـدیی کەرخ وەرگیـرام، ئەمەناچاری کردم جلە تەقلیدی و کۆنەکانم بگۆڕم بە جلـی نـوێ، ئەمە واتـا مـن بـووم بە (ئەفەنـدی) بەپێی ئەو زاراوەیەی لەو رۆژگارەدا باو بوو.

پێشتر جلی تەقلیدیم دەپۆشـی کە بریتی بوو لە لە دیشداشـەو سـایەو عەبـا، هەروەهـا عەمـامەیەکی سەوزیشـم لەسـەر دەنـا کە نیشـانە بـوو بۆ ئەوەی مـن (سـەید)م لە نەژادی پێغەمـبەر. شـایانی باسـە ئەوە بڵێم عەمـامە لەو ژینگەیەی ئێمەدا سێ جۆر بــوو، رەش و ســپی و ســەوز، عەمـــامەی رەش تایبەت بوو بەو زانا ئاینییەی سەید بوایە، عەمامەی سپی تـایبەت بە زانـایەکی ئـاینی کە سـەید نەبـێ، بەڵام عەمـامەی سـەوز تـایبەت بـوو بەو کەسـانەی وەک مـــن ســـەید بـــوون بەڵام لە کاروپیشـــەی جۆراوجۆردا کاریان دەکرد.

لەسـەرەتادا بۆ مـن زەحـمەت بوو ئەو عەمـامە سەوزە داکەنم و (سیدارە)ی فەیسەلی لەسەر بکەم،

ئەمە لەنیگای خەڵکی عەوامدا وادەگەیەنیت کە من باوەڕی کۆنی خۆم گۆڕیوەو بووم بە یەکێک لەوئەفەندییانەی باوەڕیان وایە زەوی خڕەو بارانیش لە هەڵمەوەیە.

یەکەمجار نەمدەتوانی لەبەرامبەر خەڵکیدا بە ئاشکرا بەو جلوبەرگانەوە دەربکەوم، هەوڵم دەدا ڕێگای دوورو کۆڵانی تەسک ولابەلا بگرمە بەر تا دەگەیشتمە شوێنی وەستانی ترامەوای بۆ ئەوەی خۆم بەدوور بگرم لە نیگای خەڵکی وپلارەکانیان.

بیرم دێ ڕۆژێکیان پیرەمێردێکی ناسیاومان بەو جلە تازانەوە بینیمی، بەپلارەوە پێی وتم: (لەبەر خاتری دیناری ئەوان، ئایینی خۆیان فرۆشت). گەنجێکی ناسیاو دەناسم ئەویش ناچار بوو جلەکانی بگۆڕێت وجلی نوێ بپۆشێت، بەڵام ئەو لە من پتر سڵی لە نیگاو پلاری خەڵکی دەکردەوە، چونکە باوکی زانایەکی ئاینیی ناودار بوو، بۆیە ناچار ببوو جلوبەرگە نوێیەکانی لەدوکانێکی نزیک قوتابخانەکە دابنێت، کە لەماڵ دەهاتە دەرێ جلە تەقلیدییەکانی دەپۆشی بەڵام کە دەگەیشتە دوکانەکە جلە تازەکانی لەبەر دەکردو بەپەلە دەچووە نێو قوتابخانەکەوە تا کەس نەیبینێت.

## گرفتی حەسودی (ئیرەیی)

من وەک چۆن لەقۆناغی سەرەتاییدا هەمیشە لەپێش بووم، لەقۆناغی ناوەندیشدا لەپێش بووم و هەموو ساڵێک بەیەکەم دەردەچووم. لەهاوینی ساڵی ١٩٣٥دا کاتێک ئەنجامی کۆتایی تاقیکردنەوەی گشتیی قوتابخانە ناوەندییەکان راگەیەنرا، من بەرزترین نمرەم بەدەست هێناو لەئاستی هەموو عێراقدا بەیەکەم دەرچووم.

سروشتی زیرەکی و بەیەکەم دەرچوون لە قوتابخانەداو بگرە لەهەموو بوارەکانی تری ژیانیشدا ئەوەیە کە حەسودی دەوروژێنێت و دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی حەسادەت (لەکوردیدا دەڵێین: چاوپیس یان نەگریس یان بووە بە چاوەوە -و-). حەسودی سروشتێکی بەشەریی گشتییەو لەهەموو مرۆڤێکدا هەیە، بەڵام ڕێژەی حەسودی، بەپێی فاکتەرە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان، لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕدرێت.

لەراستیدا من بەئەندازەیەکی زۆر گیرۆدەی حەسادەت و حەسودی بووم لەلایەن هەندێ لە هاوڕێ قوتابییەکانم لە قوتابخانەی سەرەتایی، ئەوان قینێکی زۆریان دەشاردەوەو هەوڵیان دەدا بەهەر شێوەیەک بێ ئازارو زیانم پێ بگەیەنن. بەڵام لە قوتابخانەی ناوەندیدا ئازارەکانی من

بەدەستی حەسودەکانەوە کەمتر بوو، دەشێت ئەمە بگەڕێنینەوە بۆ دوو هۆکار:

یەکەم: قوتابیی سەرەتایی بێگومان تەمەنی بچوکترە لە قوتابیی ناوەندی. سروشتی ئیرەیی بردنیش وایە کە پتر لەنێو منداڵاندا بەڕوونی و ئاشکرایی دەردەکەوێت وەک لە گەوران. کەسی گەورە دەتوانێت حەسادەتی خۆی بچەپێنێت یان بیشارێتەوەو رایدەگەیەنێت تەنها لەکاتێکی گونجاودا نەبێت، یان بەشێوازێک دەریدەبڕێت نەبێتە مایەی گلەیی و رەخنەی خەلکی، بەلام منال ناتوانێت کۆنترۆلی سۆزەکانی خۆی بکات، بۆیە زۆر بەئاشکرا حەسودی رادەگەیەنێت بەبێ ئەوەی پاساوی بۆ بهێنێتەوە.

دووەم: ناوەندیی کەرخ کە من تیایدا دەمخوێند، ژمارەیەکی زۆری قوتابیی لەخۆگرتبوو ودوو ئەوەندەی قوتابیانی سەرەتایی بوو، ئەو قوتابییانەش لەشوێن و ژینگەی جیاجیاو دوورەوە هاتبوون، سروشتی حەسودیش وایە کەلەنێو کەسی نزیک و هاوشێوەو هاوپۆلدا پترو توندتر دەبێت، حەسودی لای ئەوکەسانە پتر دەردەکەوێت کەلە شوێن و ژینگەیەکی بەرتەسکدا دەژین، هەر کەسێک ببینێ کە هاوڕێکەی یان هاوشێوەکەی یان هاوپۆلەکەی لەپێش خۆیەتی و لەو زیرەکترو لەپێشترە، یان شوێنێکی گرنگی گرتووە کە ئەویش خواست و تەماحی ئەو شوێنەی هەبووە، ئەوا

لەرووی دەروونییەوە دوچاری ئازارو خەفەت دەبێت. بەڵام هەرچەندە ژینگەکە بەرینترو هەمەجۆرتر بێت ئەوا ڕێژەی حەسادەت تیایدا کەمتر دەبێت. ئەمە وای لە میللەتانی سەرەتایی و دەوارنشینی کرد ڕێژەی حەسادەتیان زۆر زیاتر بێت وەک لە گەلان ومیللەتانی پێشکەوتوو و خاوەن ژیار.

**نەجیبزادە**

یەکەمبوونی من لە ناوەندیی کەرخ لەساڵی ١٩٣٥دا، وای لە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە کرد پێشنیازێک پێشکەشی وزارەتی مەعاریف بکات (کە ئەمڕۆ پێی دەڵێین وزارەتی پەروەردە) بۆ ئەوەی ناوی منیش بخرێتە لیستی ئەو قوتابییانەی یارمەتیی دارایی لەو وزارەتە وەردەگرن، یارمەتیەکەش بریتی بوو لە دینارو نیوێک لە مانگێکدا، ئەمەش بۆ ئەو سەردەمە بڕە پارەیەکی زۆر بوو، بەتایبەتی بۆ کەسێکی وەک منی هەژار، بەدەربڕینێکی تر ئەو بڕە پارەیە چوار ئەوەندەی ئەو مانگانەیە بوو کە بەر لەچەند ساڵێک لەدوکانی عەترفرۆشییەکەدا لەگەرەکی ئەنبارییەکان دەستم دەکەوت.

بەڵام ئەم نیعمەتە بۆ من زۆر درێژەی نەکێشا، لەپاش ساڵێک، وزارەت ئەو کۆمەکەی لێ بڕیم،

سەیر ئەوەیە لەکاتێکدا یارمەتیەکەیان لێبڕیم کە من لەتاقیکردنەوەکانی قۆناغی ناوەندیدا یەکەم بووم لەسەر ئاستی هەموو عێراقدا. ئەمە مەسەلەیەکە دەشێت خوێنەر باوەڕی پێ نەکات، بەڵام هەر بەراستی ئەمە رووی دا. هەر کەسێک لە دۆسیەو دەفتەری تۆماری وزارەتەکەدا بۆی بگەڕێت دەیدۆزێتەوە.

هۆکاری سەیروسەمەرەی ئەو رووداوە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێک لە فەرمانبەرە گەورەکانی وزارەت، ئەو فەرمانبەرە بەوە ناسرابوو کە لەمامەڵەو کارە ئیدارییەکانیدا لایەنگری خەڵکی شارەکەی خۆی دەکات و مامەڵەی ئەوان زووتر دەڕوێنێت، هەروەها کاروباری ئەو کەسانەش زوو بەڕێدەخات کە شەفاعەت و واسیتەیان دەکرد، ئیدی ئەوانیتری فەرامۆش دەکرد. لەراستیدا ئەم چەشنە فەرمانبەرە لەو رۆژگارەدا شتێکی شازو دەگمەن نەبوو، بەڵکو چەندین فەرمانبەری هاوشێوەی ئەو فەرمانبەرە لە فەرمانگە جیاجیاکانی حکومەتدا هەبوون، هەندێکیان تا ئێستاش ماون.

ئەم فەرمانبەرە گەورەیەی وزارەتی مەعاریف دەیویست ئەو یارمەتییە بدات بە قوتابییەکی خەڵکی شارۆچکەکەی خۆی، بەمجۆرە دەستی کرد بەگەڕان بەنێو لیستی ئەو قوتابییانەی یارمەتیەکەیان بۆ بڕاوەتەوە، بۆ ئەوەی هۆکارێک

بدۆزێتەوە، تەنانەت ئەگەر هۆکارێکی ناچیزەش بێت، تا یارمەتی لە یەکێک لەو ناوانە ببڕێت، دواجار بەداخەوە هۆکارێکی بۆ من دۆزییەوە تا یارمەتییەکەم لێ ببڕێت. هۆکارەکەیش ئەمەی خوارەوە بوو:

ڕۆژێکیان قوتابیانی یەکێک لەپۆلەکانی ئامادەیی مەرکەزی، مانگرتنیان لەتاقیکردنەوەی وانەی ئینگلیزیدا ڕاگەیاند، بۆ بەدبەختیم من یەکێک بووم لەقوتابیانی ئەو پۆلە، نەمویست خۆم لەو مانگرتنە جیابکەمەوەو بەشێوەیەکی سروشتی منیش بەشداریم کرد، مامۆستای ئینگلیزیش سفری بۆ هەموو پۆلەکە دانابوو، لەوانە بێگومان منیش، تومەز فەرمانبەرە گەورەکە ئەو نمرە زۆر خراپەی منی بینیوەو بە هەلی زانیوە، ئەوەبوو دواتر ناردی بەشوێنما بۆ ژوورەکەی، پێی ڕاگەیاندم: وزارەت بڕیاری داوە یارمەتییەکەت لێ ببڕێت لەبەر ئەوەی لە وانەی ئینگلیزیدا سفرت هێناوە.

من زۆر تکام لێکرد کە پەلە نەکات و چاوەڕێی تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵ بکات تا بزانێت نمرەکانم چۆن دەبێت نەک تاقیکردنەوەیەکی بچوکی وەرزیی. بەڵام تکاکەی ڕەتکردمەوەو داوای لێکردم لە ژوورەکەی بچمە دەرێ، پاشان دەرکەوت یارمەتییەکەی منی گواستۆتەوە بۆ ئەو قوتابیەی خەڵکی شارۆچکەکەی خۆی بوو. پاشان زانیم ئەو قوتابیە لەخێزانێکی خۆشگوزەران و

ناسـراوه، تـا ئەمـڕۆش لە ژیانـدا مـاوەو جاروبـار دەیبینم و ڕۆژانی ڕابردووی بیر دەخەمەوە.

گلەیـی لە کـردەوەی ئەو فەرمـانبەرە گەورەیە ناکرێت، چونکە ئەو لە ژینگەیەکدا پەروەردە بووە باوەڕی وایە پیاو ئەو پیـاوەیە یـارمەتیی خەڵکـی گەڕەکەکەی خۆی یان شـارو شارۆچکەکەی خۆی بـدات نەک گەڕەک و شـارێکی دی. یـان کەسـێک واسـیتە بکـات ڕێک وەک شـێوازی عەشـایەری کە پێیـان وایە هەمـوو شتێک بە شـەفاعەت (ڕوولێنـان وتکـا) و واسـیتە بەڕێوە دەچێت. ئەو فەرمـانبەرە گەورەیە لەسـاڵانی شەستەکاندا مرد، پاش مردنی پرسـیارم لەو خەڵکـانە کـرد کە دەیانناسـی و لـێم پرسین چۆن پیاوێک بوو؟، هەموویان بەشێوەیەکی جـوان ستایشـیان دەکـرد، دەیـانووت پیـاوێکی (نەجیب) و (نەجیبزادە) و (مەرد) و (جوامێر) بـوو، پیــاوەتیی لەدەســت دەهــات، زۆری تـریش لەو وەسفانەی لەو کاتەدا لەنێو خەڵکیدا باوبوون.

ئەو فەرمانبەرە بەلای منەوە کەسێکی ستەمکارو نارەســەن بـوو، بەڵام لەتێڕوانینـی ئەو کەسـانەی ســوودی بۆیــان هەبـوو، پیـاوێکی دادپەروەرو بەخشندە بوو، ئەمەش وێنەیەکی ڕوونمان دەداتی دەربــارەی سروشــتی مــرۆڤ لەهەمــوو کــات وشوێنێکدا، دەشێت زوڵم و ستەم لە دیدی لایەنێک، دادپەروەری بێت لە دیدی لایەنێکی تر.

**سەرچاوە:**

الدكتور علي الوردي، دروس في حياتي، اعداد: ماجد السامرائي،
مكتبة المجلة للطباعة والنشر والتوزيع، بغداد، ٢٠١٥.

**تێبینی:**
ئەم کتێبە بریتییە لە دوو بەش، بەشی یەکەم بەناونیشانی وانەکانی ژیانم، بەشی دووەم بریتییە لە کۆمەڵێ چاوپێکەوتن لەگەڵ عەلی وەردی دەربارەی بابەتی پاراسایکۆلۆجی کە هیچ پەیوەندییەکیان بە بەشی یەکەمەوە نییە، بۆیە ئێمە تەنها بەشی یەکەممان وەرگێڕاوە